

# ناوی کتێب: بولێڵە


بابـــــەت: یادداشت

نـــــووسەر: عەلی حامید

دیـــزایـــن: ئومێد محەمەد

بـــــەرگ: ئارام عەلی

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٠

تـــیـــراژ: ٥٠٠ دانە

نـــــرخ: ٣٠٠٠ دینار

چـــــاپ: چاپخانەی تاران

# پێڕست

## پێشەکی

نووسینەوەی بیرەوەریی و یادداشت، جۆرێکە لە کاری (کای کۆن بە با کردن)، کوردەوارییش، واتە پەندی پێشینان و وتەی جێماوی باووباپیران، ئامۆژگاریمان دەکات کە ئەو کارە نەکەین، واتە کای کۆن بە با نەکەین و بیرەوەریی نەنووسینەوە.

ڕەنگە بەشێکی زۆری ترس و سامی فەرهەنگی کورد لە کاری کای کۆن بەباکردن، بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە کورد نایەوێت پەند لە ڕابوردوو و مێژووی خۆی وەربگرێت، ئەمەیش وای کردووە کە مێژوومان بەردەوام لە ناو بازنەیەکی داخراودا بخولێتەوە و هەمیشە بەسەرهات و قەوماومان دووبارەببێتەوە و هەموو جارێک بگەڕێینەوە هەمان خاڵ کە خاڵی سەرەتایە.

لەڕاستیدا باسکردن و گێڕانەوەی مێژوو و ڕابوردو، بۆ پەند لێوەرگرتنە، نەک کولاندنەوەی برین و نوێکردنەوەی زام و ژانە کۆنەکان، بەو جۆرەی کە هەندێک کەس، کە بە گێڕانەوەی ئەو ڕابوردووە قەڵس دەبن و تەنگە دەیانگرێت، لە گێڕانەوەی سڵدەکەنەوە. ڕابوردوو بۆ ئەوە سەرلەنوێ دەگێڕرێتەوە تاکو پەندی لێوەربگیرێت، کاتێک کە پەندیشی لێ وەرگیرا، دووبارە ناکرێتەوە.

خاوەنی ئەم یادداشت و بیرەوەرییە مرۆڤێکی خێر لە خۆ نەدیوی ئەم وڵاتەیە: عەلی حامید قادر لە ساڵی ١٩٣٣ لە گەڕەکی سەرگۆل هاتووەتە دونیاوە. لە هەڕەتی لاوییەوە و لە پاڵ ڕەنجدان و ئیشکردن لەپێناوی پەیداکردنی بژێوی ژیاندا، تێکەڵ بە چالاکیی سیاسی بووە و هەر لە سەرەتاوە چووەتە ڕیزەکانی حیزبی شیوعی عێراقەوە. ئەندامێکی چوست و چالاکی ئەو حیزبە بووە، بەتایبەتی لە ڕۆژە سەختەکاندا و بۆ تەنها ڕۆژێک دەستی لە خەبات هەڵنەگرتووە و میللەت و حیزبەکەی لە تەنگانەدا جێنەهێشتووە.

عەلی حامید، سەرەتای کار و پیشەکانی ژیانی بە کرێکاری دەستپێکردووە و بووەتە بەردتاش یاخود نەقاڕ و یەکێک بووە لە نەقارە دیار و ناسراوەکانی سلێمانی و لە زۆر باڵەخانە و بینای کۆنی سلێمانیدا کاری تاشینی بەردی کردووە و لەو بوارەدا جێ دەستی دیارە، بەتایبەتی لە ساڵانی پەنجای سەدەی پێشوودا. لە پاڵ کاری بەردتاشیندا، هەوڵیداوە دەستی لە فرمانێکی حکومەتیی دەستگیربێت هەر بۆیە لە کۆتایی ساڵانی پەنجادا لە فەرمانگەی گواستنەوەی سلێمانی یاخود مەسڵەحەی نەقڵی ڕیکاب، بووە بە باجگر (جابی) و تا سەرەتای ساڵانی حەفتا، لە سەر ئەم فرمانەی بەردەوام بووە. لەدواییدا لە کارگێڕیی خۆجێیەتیی سلێمانی دامەزراوە و بووەتە فەرمانبەر. لەپاش ماوەیەک گواستراوەتەوە بۆ کتێبخانەی گشتیی سلێمانی، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٨دا دیسان گواستراوەتەوە بۆ کارگێڕیی خۆجێیەتی و لە ساڵی١٩٧٩ تا ساڵی ١٩٨٩ لێپرسراوی دابەشکردنی چیمەنتۆی پارێزگای سلێمانی بووە لەو فەرمانگەیە. تا ڕۆژی دەستگیر کردنی لەلایەن ئەمنی

سلێمانییەوە لە کۆتایی مانگی پێنجی ساڵی ١٩٨٩ لەو فەرمانگەیە بووە. لە شەوی ٣٠ لە سەر ٣١ی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٨٩دا لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە بە تۆمەتی پەیوەندیی بە ڕێکخستنە نهێنییەکانی شاری سلێمانیی حیزبی شیوعییەوە دەستگیرکراوە. لەپاش نزیکەی ساڵێک لە لێکۆڵینەوە و ئازاردان و ئەشکەنجەدان لە ڕۆژی ٧ی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٩٠ دراوەتە مەحکەمەی سەورە و بڕیاری زیندانیکردنی تاهەتایی بە سەردا سەپێنراوە. لە ڕۆژی ٢٨ی مانگی ١٢ی ساڵی١٩٩١ بە لێبووردنی گشتی لە زیندان ئازادکراوە، بەڵام چونکە لە کاتی ئەشکەنجەدان، لە گرتوخانەکانی ئەمنی سلێمانی و تکریت و بەغدا چاوی تووشی نەخۆشی بووە بەڵام پشتگوێخراوە و نەبراەتە نەخۆشخانە و چارەسەری پێویستی بۆ نەکراوە، هەردوو چاوی لەدەست داوە، هەر بۆیە بە نابینایی یاخود کوێریی لە زیندان ئازاد بووە.

بیست و حەوت ساڵی کۆتایی تەمەنی، واتە لەمانگی دوانزەی ساڵی ١٩٩١ تا مانگی ئەیلولی ساڵی ٢٠١٨ بە کوێریی و زۆربەی کات لە ماڵەوە ژیاوە. ڕۆژی ٧ی مانگی ئەیلولی ساڵی ٢٠١٨ کۆچی دوایی کردووە.

ئەگەرچی بڕیار بوو ئەم یادداشتە بەر لە کۆچی دوایی کردنی بڵاوبکرێتەوە، بەڵام لە بەر بڕێک هۆکار کە زیاتر پەیوەندییان بە نووسینەوە و کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی باس و بابەتەکانی یادداشتەکەوە هەیە، ئەو دەرفەتە لە کاتی خۆیدا نەڕەخسا بۆیە چاپ و بڵاوکردنەوەکەی کەوتە ئێستا و ئەم کاتە.

لە ناو ئەم یادداشتانەدا ناوی زۆر کەس هاتووە کە هەریەک لە شوێنی خۆیدا و لە پەیوەست بە ڕووداوێکەوە ناوی براوە کە

پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بە ڕووداوەکەوە هەیە. ئەم یادداشتانە نە بۆ قایلکردنی هیچ کەس و نە بۆ دوژمنایەتیکردنی هیچ کەس نووسراوە، ئەگەرچی نووسەرەکەی سەردەمانێکی دوورودرێژ نەک هەر لایەنگر بەڵکو ئەندامی حیزبی شیوعی بووە، بەڵام وەکو کەسێک و لە سەردەمێکدا نووسیونێتییەوە کە دەستی لە کاری سیاسی هەڵگرتووە و وەکو بێلایەنێک ڕووداوەکانی گێڕاوەتەوە.

قسەلەڕوویی و بێشەرمیی لە وتنی ڕاستی، کە تایبەتمەندیی خاوەنی ئەم یادداشتەن، ئەوانەی لە دەرەوە نووسەریان ناسیوە، هەم دۆست و هەم دوژمن، دەزانن تایبەتمەندییەکە لە ناو ژیانی کردەیی نووسەرەوە شۆڕبووەتەوە ناو ئەم یادداشتە و لەگەڵ نووسینەوەی باس و بابەتەکانی ناو یادداشتەکەدا لە دایک نەبوون.

لە کۆتاییدا ئومێدەوارم ئەم یادداشتە، لە زیاد لە ڕوویەکەوە، پێچەوانەی ئەو یادداشتە سیاسییانە بێت کە تا ئێستا نووسراون و بڵاوبوونەتەوە، نەک تەنها لەو ڕووەوە کە چیرۆک و بەسەرهاتەکانی لە شاردا ڕوویان داوە نەک لە شاخ.

**سامان عەلی حامید**
**سلێمانی**
**٢٠٢٠/١٠/٥**

## چەتەگەریی سیاسی

لە ساڵانی شەست، لە گەڕەکی شیوی قازی لە سلێمانی، جارێکیان لە گەرمەی کۆبوونەوەیەکی حیزبیدا، کە هەریەک لە: من و ئەحمەد مارفی نانەوا و ئەحمەد حامید و مەلا عەزیزی نەقارڕ و حەمەئەمین ڕەشید ئامادەی بوون، لە ماڵی کاک حەمەئەمین ڕەشید کە فەرمانبەر بوو لە پۆستەی سلێمانی و ماڵەکەیشی بەرانبەر بە ماڵی عەلی چەلەبی بوو کە یار و هەوادارێکی جەلالییەکان و ناحەزێکی شیوعییەکان بوو، جەلالییەکان بە نوێنەرایەتی سدیقی ئامەدرێژ و فازیڵ ناوێک، کە کارمەندی سینەما ڕەشید بوو، هەڵیانکوتایە سەرمان. لەدوای ماوەیەک مشتومڕ و گفتوگۆ، بەمەبەستی ئاڵۆزنەبوونی دۆخەکە، قایل بووین کە لەبری ڕاپێچ و دەستگیرکردنی هەمووومان، ئەحمەد مارفی نانەوا لەگەڵ خۆیاندا ببەن. ئەوانیش لەگەڵ پەلکێشکردنی ئەحمەد مارفی نانەوادا، کۆنووسی کۆبوونەوەکە و بڕی سەد و سی دینار پارەی ئابوونە و پیتاکی کۆکراوەی حیزبییان لەگەڵ خۆیاندا برد و تەنها لە دوای دوو ڕۆژ، ئینجا ئەحمەد مارفیان ئازاد کرد. واتە پارە و کۆنووسی کۆبوونەوەکە ئێوە خۆش!

## وەك قۆچی قوربانی لە مرۆڤی شیوعی ڕوانین

لە ساڵانی شەست و حەفتادا ئیشی نەقارڕیم بۆ حەمەی حاجی ساڵحی حەمامچی و فایەقی حەمەی پۆلیس دەکرد کە نووسینگەی بەڵێندەرایەتی هەبوو. ڕۆژێکیان هەرسێکمان لە دووکانەکەی فایەق دانیشتبووین و قەیرێک بوو دابووومان بە

ڕازی باس و قسەدا، پاش ئەوەی بەینێک بێدەنگ بووین، فایەق ڕووخسەتی ڕۆیشتنی خواست و هەستایە سەر پێ و ڕووی کردە حەمەی حاجی ساڵح و وتی: کاکە حەمە، دوو شیوعیم کردووە بە خێری مەولودی پێغەمبەر، تەندەرێکم جێهێشتووە لە ئەشغال دەچم بە سەروەختێوە بەڵکو بۆم دەربچێت و ئیشێکم دەست بکەوێت. هێشتا فایەق لە دووکانەکە نەچووبووە دەرەوە، حەمەی حاجی ساڵح بە گلەییەوە بانگی لێ کرد و پێی وت: کاک فایەق شوورەیی نییە بۆ تۆ ئەو قسەیە لە ڕووی مندا دەکەیت، لەکاتێکدا کە زۆر چاک دەزانیت من شیوعیم؟! فایەق وەڵامیدایەوە و وتی: کاکە حەمە تۆ شیوعی نیت، بەڵکو کەسێکیت تینت بۆ هاتووە.

## یەکەمین ئەزموونی ژیانم لەگەڵ کتێب شاردنەوەدا

لە هۆدە و هەیوانێکی ماڵی باوکم لە گەڕەکی خەبات نیشتەجێبووین، هەندێک کتێب و بڵاوکراوەی مارکسیی و شیوعیم لە ماڵەوە هەبوو، لەبەر خراپبوونی بارودۆخی سیاسی کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خراپتریش دەبوو، بیرم لەوە کردەوە کە، نەبا قەدەغەی هاتوچۆ واتە مەنعولتەجەول بکرێت و کتێبەکانم دەستیان بە سەردا بگیرێت و بفەوتێنرێن، با لای خۆم نەیانهێڵم و بیانبەم و بیانشارمەوە. بڕیارم دا بیانبەم بۆ قەرەتۆغان و لەوێ لە ماڵی پوورم، بیانشارمەوە.

ساڵ ساڵی ١٩٦٢ بوو، ڕۆژێکیان کتێبەکان هەموویانم کۆکردەوە و بە ناوی سەردانەوە و لەگەڵ ماڵەوەدا چووین

بۆ قەرەتۆغان. لەو کاتەدا حکومەتی عەبدولکەریم قاسم بوو بووە حکومەتێکی تەواو سەربازیی و بۆ مانەوەیشی کەوتبووە خۆی، هاوکات ناوی پێشمەرگەیش بە گەرمی کەوتبووە ناو ناوانەوە، بەتایبەتی چونکە ناوبەناو دەیاندا بە سەر دێیەکدا، واتە چالاکییەکانیان زیادی کردبوو. هەڵبەتە ئێمە بۆ شەوەکەی لە قەرەتۆغانماینەوە، بۆ سبەینێکەی کاتێکمان زانی حکومەت دەوری قەرەتۆغانی گرت. خەمی شاردنەوەی کتێبەکان ئۆقرەیان لەبەر بڕیبووم، بە پوورە ڕەحمە، کە دایکی خێزانم بوو، وت: تەگبیر چییە و چی بکەین؟ لە کوێ بیانشارینەوە؟ماڵی پوورم هۆدەیەکیان هەبوو لە نهۆمی سەرەوە، لە هۆدەکە سوێنەیەکی لە سەر زەوی دەمەونخون دا نابوو، وتی: بیانخەرە ژێر ئەم سوێنەیەوە. کتێبەکانم کرد بە ژێر سوێنەکەوە. لەم سەروبەندەدا لەناکاو موختاری گەڕەک کە حەمەسەعیدی حەمەکۆڵ بوو، لەگەڵ یاریدەدەری ئەمن و چەند ئەمنێکدا خۆیان کرد بە ژووردا. ڕێکەوت یەکێک لەو ئەمنانەم ناسییەوە کە هاتنە ژوورەوە، پلەی عەریف بوو، بەڵام جلوبەرگی کوردی لەبەرکردبوو، عومەری حەمەئەمین سامسام بوو. عومەریش منی ناسی، وتی: چی دەکەیت لێرە؟ وتم: خەڵکی قەرەتۆغانم و ئێرە ماڵی پوورمە. گەرچی ئەمنەکان ماڵەکەیان پشکنی، بەڵام چونکە بەوردیی نەگەڕان و نەیانپشکنی، کتێبەکانیان نەدۆزییەوە و لێیان دا ڕۆیشتن، بەو هۆیەشەوە خۆشبەختانە هەم خۆم و هەم کتێبەکانیشم لە ڕۆژێکی ڕەش قوتارمان بوو.

## مستەفا بارزانی، دەربارەی تیرۆری ئەوڕەحمانی سالْحی خلە و مەلا عەلی موزەمید، چی وت؟

کانیی ماسی، تەنها ناوێکی تری گوندی قەرەتۆغان نەبوو کە دێیەکە کەوتووەتە بەشی باشووری خۆرهەلاتی شاری سلێمانی، بەلْکو هەم ناوی کوشتارگە و هەم ناوی تاقمێک شیوعیکوژ بوو کە لە دەهەی شەستی سەدەی پێشوودا دەیان کەسایەتی و ئەندامی بەرچاو و چالاکی حیزبی شیوعییان تیرۆرکرد. زۆرجار شیوعییەکان لە ناو بازاڕ پەلاماردەدران و دەرفێنران یاخود لە مالْەوە و لە ناو مالْ و مندالْ و کەس و کاریاندا هەلْدەکوترایە سەریان و بەرەو کانیی ماسی دەرفێنران و لەوێ لەدوای ئەشکەنجەدانی زۆر دەکوژران. تەنها تاوانێکیشیان ئەوە بوو کە شیوعی بوون. ئەوەی کە جێی داخ بوو ئەوە بوو کە خەلْکێکی جووتیاری دەستبەتالْ و بێکاری گوندەکەیش لەم کوشتن و بڕینەی شیوعییەکاندا بەشداربوون و تێوەگلابوون.

ڕۆژێکیان پیاوەکانی کانیی ماسی، لە بەر دەم کەبابخانەکەی عەباسی ئەبوشوارب لە مەیدانی برنجەکە، پەلاماری ئەوڕەحمانی سالْحی خلەیان دا بە مەبەستی گرتن و ڕفاندنی، ئەوڕەحمان کادرێکی جووتیاریی چالاکی شیوعی بوو، بەلاْم ئەو خۆی نەدا بە دەستەوە و بەرگری کرد و لە دەستیان هەلْهات، وا دیارە کە بەرەو مالْەوە هەلْهاتبوو، بەلاْم نەیارانی حیزبی شیوعی، کە ئەو کاتە دەمامکی نەتەوەپەرستییان پۆشیبوو و هەم لە جەلالییەکان و هەم لە پارتی و هەمیش سەر بە حکومەت بوون، چوونە سەری بۆ مالْەوە و بە زامداریی لەمالْەوە دەستبەسەریان کرد و بەرەو کانیی ماسی ڕفاندیان.

ئەوڕەحمان هەمووی چەند ڕۆژێک بوو خێزانی پێکەوەنابوو، هاوسەرەکەی کچی حەمەفەرەج بوو کە پیاوێکی خەڵکی گوندی کانیی بی لای دەربەندیخان بوو و هەواداری حیزبی شیوعی بوو. ئەوانەی کە چوونە سەر ئەوڕەحمانی ساڵحی خلە بۆ ماڵەوە، دوو کەس بوون، کە دیسان لە ژێر پەردەی کوردایەتیدا هاوکاریی و دەستگیرۆیی شیوعیکوژەکانی کانیی ماسییان دەکرد، ئەوانیش فەرەجی نەریمان و عەبدوڵڵا نەقارِ قڕگەیی بوون.

شیوعیکوژەکانی کانیی ماسی، دوابەدوای ئەوڕەحمان، مەلا عەلی موزەمیدیان ڕفاند کە ماڵیان لە گەڕەکی سابوونکەران بوو، هەروەها ئەمیشیان بەرەو کانیی ماسی برد. لەپاش ڕفاندنیان، کەس و کاریان زۆریان هەوڵدا بچن سەردانیان بکەن، بەڵام بێسوود بوو. عوسەی ئامە و پیاوەکانی ڕێگەی بینینیان نەدان. دواتر هەر لە کانیی ماسی ئەوڕەحمان و مەلا عەلی موزەمیدیان گولەباران کرد و لاشەکانیان لە چەمی چاوڕەشە لە خوار کانیی ماسییەوە فڕێدان. ئەوان لە کاتی شەودا تیرۆرکران، هەر بۆیە تەنها بۆ سبەینێ هەواڵی تیرۆریان بە شاردا بڵاوبووەوە. منیش هەواڵی تیرۆرکردنەکەیانم لە ڕێگای ئەحمەد قادر ڕەسوڵ ناسراو بە ئەحمەدی چایچییەوە بیست، کە لە نزیک ئەسحابەسپی چاخانەی هەبوو. کاک ئەحمەدیش لەلایەنی خۆیەوە هەواڵەکەی لە نوری ئەحمەدی تەهاوە زانیبوو کە بەردەوام هاموشۆی چاخانەکەی کاک ئەحمەدی دەکرد. ئیتر دەستوبرد کەوتمە خۆم و هەواڵەکەم بە حیزب ڕاگەیاند، حیزبیش کەس و کاری هەردو غەدرلێکراوەکەی ڕاسپارد

چوون تەرمەکانیان هێنانەوە، کە سەگ و ئاژەڵی دڕندە بەشێک لە لاشەکانیانی خواردبوو.

لەپاش شۆردن و بەخاکسپاردنیان، جلە خوێناوییەکانیان پێچانەوە و وەک سکاڵا بردیان پیشانی مستەفا بارزانییان دا کە لە دەوروبەری ڕانیە لای کانیی ماران دادەنیشت. بارزانی، پاش ئەوەی کە جلە لە خوێن شەڵاڵەکانی ئەوڕەحمان و مەلا عەلی بینی، وتی: ئەمانە کە کوژراون، لە هەرە سەرسەرییە بەناوبانگەکانی شاری سلێمانین و من خۆم فەرمانم کردووە کە بیانکوژن!

کانیی ماسی، نەک هەر لاپەڕەیەکی ڕەشی مێژووی سیاسیی شاری سلێمانییە، بەڵکو پەڵەیەکی شەرمیشە بە تەوێڵی کوردایەتییەکەی پارتی بە هەردوو باڵەکەیەوە. ئەو ڕۆژگارە شیوعییەکان بێبەزەییانە لە نێوان لەلایەک بەرداشی نەتەوەپەرستە عەرەبەکان، کە بەعس و ناسرییەکان و عەبدولسەلام عارف نوێنەرایەتییان دەکردن و لەلایەکی تر بەرداشی نەتەوەچییە کوردەکان کە پارتی و جەلالییەکان نمایندەییان دەکردن، پەستێورابوون، ئاشی ناحەزیی و دلڕەشیی هەردوو بەرداش دلڕەقانە دەیهاڕین. کەس و کاری ئەو شیوعییانەی کە لەو سەردەمەدا لە کردەی کانیی ماسیدا تیرۆرکران، نەک هەر پێویستە داوای لێبووردنیان لێ بکرێت، بەڵکو پێویستە قەرەبوویش بکرێنەوە.

## پیاوە ماتۆڕسوارەکە

وەستا عەزیز حەسەن، ناسراو بە عەزەی ئایشێ، کە وەستای بەننا بوو، بۆی گێڕامەوە و وتی: لە سالانی حەفتادا لە عەربەت لە دروستکردنی بالەخانەیەکی نوێ بۆ بەڕێوەبەرایەتی کشتوکالی عەربەتی خوارەوە ئیشم دەکرد، پیاوێک بە سواری ماتۆڕ لە دەربەندیخانەوە وەکو چاودێر دەهات بۆ سەر ئیشەکە، هەستم دەکرد کە ئەو پیاوە لەلایەن حکومەتەوە چاودێریی دەکرا. ڕۆژانە بەردەوام دەهات چاودێریی ئیشکردن لە بالەخانەکەی دەکرد.

ڕۆژێکیان هەوالی ئەوەمان بیست حکومەت کابرای دەستگیر کردووە. دواتر لە ڕێگای حیزبەوە زانیمان کە ماتۆڕسوارەکە ئەحمەد ڕەجەب بوو، کە لەگەل حسێن نادر زاوای یەکتر بوون و هەردوکیان خەلکی خانەقین بوون. لەدواییدا دەرکەوت کە حسێن نادر لەگەل شێخ عەلی شێخ حسێن بەرزنجی و تۆفیق ئەحمەد بەنهێنی ڕێکخراوەکانی حیزبییان لە کەرکووک سەرپەرشتی دەکرد و دەبرد بە ڕێگاوە. ئەوەبوو ناوبراوان پاش ماوەیەک دەستگیرکران، بەلام لەدوای بەینێکی کەم ئەحمەد ڕەجەب ئازادکرا و بەشوێن ئەویشدا حسێن نادر و تۆفیق ئەحمەد یش ئازاد بوون. بە بەردانەکانیاندا دیاربوو کە هەموویان ئۆبال و بەرپرسیارێتی هەموو کار و ئەرکەکانی ڕێکخراوە نهێنییەکانی حیزبیان لە کەرکووک خستووەتە ئەستۆی شێخ عەلی، کە دواتر هەولی زۆر درا بۆ ئازادکردنی و ڕزگارکردنی ژیانی لە مردن، بەلام ڕژێم ملی بۆ بەردانی نەدا و لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەدا شەهیدی کرد.

## ئەو پیاوە ناسراوەی (کانیی ماسی)
## لە ماڵی ئەوان چی دەکرد؟

عەلی شەریف، کە کەسایەتییەکی شیوعی ناسراو بوو، خەڵکی گوندی کەمالان بوو، ماڵی لە شار لە گەڕەکی جاران گۆیژە و ئێستا سەیوان چەند کۆڵانێک لەولای ماڵی خۆمان و لەودیو مەخزەنەکەی عەبەی کۆلا بوو، لەبەرئەوەی کە ماڵی ئێمەیش لەو نزیکانە و بەرانبەر بە مەخزەنەکە بوو، ناوەڕاستی سالانی حەفتا هەندێک شەو بە سەردان دەچووم بۆ لای بۆ ماڵەوە، پێکەوە لە حەوشەی ماڵەکەیان دادەنیشتین و ئەماندا بە ڕازی قسە و باس و خواسی سیاسیدا. هەر لەو سالانەدا شەوێکی هاوین چوومە سەردانی، تەماشام کرد عەلی لە حەوشەی ماڵیان لە سەر کورسییەک دانیشتووە و لەلای شانی چەپیشییەوە لە سەر کورسییەک حسەی فارس دانیشتووە! کە یەکێک بوو لە شیوعیکوژەکانی کانیی ماسی لە سالانی شەستی سەدەی ڕابووردودا.

تا ئێستایش تێنەگەیشتم و هەر وەکو لەگەز و مەتەڵۆک لام ماوەتەوە کە حسەی فارسی شیوعیکوژ لە ماڵی عەلی شەریفی شیوعی چی دەکرد؟! ئایا خزمایەتی و دۆستایەتییان هەبوو پێکەوە یان چی؟! ئێستا و ئەوسایش لە نهێنیی ئەو پەیوەندییەیان، کە هاموشۆیش هەبوو لە نێوانیاندا، سەرم دەرنەکرد.

## سیخوڕەکەی کارگێڕیی خۆجێیەتی

لە کارگێڕیی خۆجێیی (ئیدارەی محەلی) سلێمانی فەرمانبەر بووم، کە باڵەخانەکەی لە سەرا-ی ناوەندی شار بوو. جەلال

حەسەن سەرشەقامی، کە کاتی خۆی پۆلیسی ئەمن بوو، لە کارگێڕیی خۆجێیەتی بە فەرمانبەر دامەزرێنرا لە بەشی ئەندازیاری و ئیشی نووسینی دەکرد، واتە نووسەر (کاتب) بوو. بەڵام لەڕاستییدا ئەم جەلالە لە سیخوڕێکی دەزگای ئەمن زیاتر نەبوو و دوو جار منی کرد بە تەڵەی ئەمنی سلێمانییەوە.

من لەوەوبەر نەمدەزانی و بێئاگابووم لەوەی کە جەلال سیخوڕی ئەمنە، بەڵام لە ساڵانی حەفتادا، بەتایبەتی لەدوای پێکهێنانی بەرە سیاسییەکەی نێوان بەعس و حیزبی شیوعی کە لە ساڵی١٩٧٣ تاکو ساڵی١٩٧٩ی خایاند و کە ئیتر بە هۆی کار و چالاکیی حیزبیی ئاشکراوە هەم حیزبی شیوعی و ڕێکخراوەکانی ئاشکرا بوون و هەم منیش ناوم کەوتە ناو ناوانەوە، ئەم جەلال حەسەنەیش بۆ ئەوە لەم فەرمانگەیە دانرابوو تاکو چاودێریی ئەو کەسانە بکات کە لە سەروەختی بەرەدا شیوعی بوون و بە ئاشکرا ئیشیانکردبوو. ئەوکات ماڵمان لە خانوویەکی حکومییدا بوو لە بەرانبەر مەخزەنەکەی عەبەی کۆلا لە گەڕەکی گۆیژە.

بەیانییەکیان لە ماڵ هاتمە دەرەوە و بەرەو فەرمانگە ملی ڕێگەم گرتەبەر، تەماشامکرد لەمبەر و لەوبەری ئەو شەقامە جووتئاراستەیە کە لە بەری خۆمان لەلای سەروو ئامادەیی ئەزمڕی کوڕان و لەلای خواروو ئامادەیی سلێمانیی کچان و لە بەری ئەوبەریش ناوەندیی ڕۆژهەڵاتی کوڕانی لێیە، جگە لەوەی کە سەر شۆستەکان جەنجاڵن بە هاتن و چوون و جموجوڵی قوتابی، چەند کەسێکی جێی گومانم بەدی کرد لەمبەر و لەوبەری شەقامەکە ڕاوەستابوون. بێئاگابووم لەوەی کە ئەوانە ئەمنن و بۆ چاودێریی و شوێنکەوتنی من دانراون.

کۆڵانە و کۆڵان لە گەڕەکی گاورانەوە بۆ مزگەوتی هەمزاغا و لەوێوە بۆ سابوونکەران بەرەوخوار بوومەوە تا گەیشتمە بەر دەم دووکانەکەی عوسمان وێڵەدەری لە شەقامی سابوونکەران. عوسمان لە بەر دەم دووکانەکەیدا ڕاوەستابوو ئیتر بۆ وچانێکی کورت لەلای عوسمان لامدا و لەپاش بەیانی باش و سڵاوکردن وتم: ئا کاک عوسمان گیان خێری ئیمانت پارچەیەک دەستەسڕی کاغەزم بدەرێ، ئەویش وتی: عەلی ئاگات لێیە ئەو زەلامانە شوێن تۆ کەوتوون؟! هەڵبەتە من لە بەڕێکەوتنمدا لە ماڵەوە تاکو دووکانەکەی عوسمان ئاوڕم نەدابووەوە تا بزانم کەس دوامکەوتووە یان نا. کاتێک کە ڕوانیم بینیم زەلامەکان لەمبەر و ئەوبەری دووکانەکەی عوسمان ڕاوەستابوون. لە خوار دووکانەکەوە وێستگەی وەستانی پاسی مەسڵەحە هەبوو، لە دیوی ئەمدیو پاسەکەوە ڕەتبووم، لە خوار ئەو دووکانەوە کۆڵانێک هەیە دەچێتەوە سەر قەزازەکان، هەربینا لەودیو پاسەکەوە یەکێک لە زەلامەکان ڕووبەڕووم هات و باوەشی پێدا کردم و بەرەو کۆڵانەکە و دوور لە چاوی ڕێبواران دووریخستمەوە. داوای ناسنامەی لێ کردم، ناسنامەکەمم پێی دا، چەند جارێک ئەمدیو و ئەودیو تەماشای کرد، پاشان ناسنامەکەی دایەوە دەستم و ڕێگەی پێدام کە بڕۆم.

هەمووی پێنج خولەکێکی مابوو بۆ کاتی ئامادەبوونم لە فەرمانگە کاتێک کە گەیشتمە سەر کارەکەم لە ئیدارە محەلی. لەوێ ڕووداوەکەم بۆ هاوڕێیەکم گێڕایەوە، کەچی سەرنج دەدەم چەند هەنگاوێک لەولاترەوە جەلال حەسەنی ئەڵقەلەگوێ بەوردیی گوێی بۆ قسەکانم هەڵخستووە. گەرچی ئەو ڕۆژەم

وەک ڕۆژێکی ناخۆش، واتە درەنگ لێ ڕۆیشت، بەڵام کاتژمێر دەوروبەری دوانزەی نیوەڕۆ بوو کاتێکم زانی مەفرەزەیەکی ئەمن خۆیان کرد بە ژوورەکەمدا لە فەرمانگە و بێ سێ و دوو هەر خێرا دەستیاندایە بن هەنگڵم و لەگەڵ خۆیاندا بردیانم.

سەروەختێک کە بەرەو نهۆمی خوارەوە بووینەوە و گەیشتینە سەر پلیکانەکان، ڕووم تەقی بە ڕووی جەلال عومەردا، کە هاوپیشەم بوو لە فەرمانگەکە، دیمەنەکەی بەلاوە نامۆ و سەیر بوو، پرسی و وتی: عەلی ئەوە چی ڕوویداوە؟ وتم: بێئاگام، نازانم. ئەمنەکان خێسەیان لە کاک جەلال کرد تاکو دووربکەوێتەوە و لە سەر ڕێگایان لابچێت. گەیشتینە حەوشەی فەرمانگە و ئەمنەکان خستیانمە ناو ئۆتۆمبێلەکەی خۆیانەوە و ئۆتۆمبێلی ئەمن بەرەو بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێمانی کەوتەڕێ.

کاتێک گەیشتینە بەڕێوەبەرایەتی، بردیانمە هۆدەیەک کە ژمارەیەکی زۆر ئەمنی لێ دانیشتبوون. دیاربوو کە لیژنەیەکی تایبەتیان پێکهێنابوو. لە لیژنەکە کەسێکیانم ناسییەوە، کەمال پشدەری بوو، پێیانوتم: تۆ لەگەڵ حیزبی شیوعی ئیش دەکەیت؟ وتم: من ئیش لەگەڵ هیچ لایەنێکی سیاسی ناکەم. وتیان: دەبێت هاوکارییمان بکەیت. وتم: من بەوەی کە وازم لە شیوعییەت هێناوە، هاوکاریی ئێوەم کردووە و بڕیاریشمداوە کە ئیش لەگەڵ هیچ لایەنێکی سیاسی نەکەم و ئەو ئەرکەیش کە لە فەرمانگەکەم پێم سپێردراوە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە بەجێی دەهێنم. ئەگەر بەڵگەیەکیشتان هەیە کە من پەیوەندییم بە هەر کۆڕ و کۆمەڵێکی سیاسییەوە هەیە، فەرموو لێپرسینەوەم لەگەڵ بکەن.

لەپاش نزیکەی کاتژمێرێک هێنان و بردن ئەوسا لە دەستیان ڕزگارم بوو و گەڕامەوە بۆ فەرمانگە. لەوێ لە فەرمانگە، هەندێک کەس بەتایبەتی فەرەج قابلەمە، کە ئەوکات وەک ژمێریار بەڕێوەبەری خەزێنە بوو، وەک توانج توانجی تێگرتم و بە شۆخییەوە وتی: عەلی تۆببەی کردووە، بۆیە وا زوو گەڕاوەتەوە. منیش پێموت: تۆببەی گورگ، مەرگە.

## پیاوە نیشتمانپەروەرەکە

وادیارە هەندێک لە مرۆڤە خوێندەوار و ڕووناکبیرەکانی ئێمە زیاد لە ڕوو یاخود زیاتر لە کەسێتییەکیان هەیە. یەکێکی کۆمەڵایەتی کە کەسێتییە ڕاستەقینەکەیە و یەکێکی ڕووناکبیریی کە ڕووە ناڕاستەقینە یاخود ڕووالەتییەکەیە. بەیانیان کاتێک کە ساڵح دیلان بە پێ لە تووی مەلیک، کە ماڵیان لەوێ بوو، دەهاتە بەر دەرکی سەرا، لەپێشدا سەرێکی لە کارگێڕیی خۆجێیی (ئیدارە محەلی) دەدا و لەدواییدا ڕووە و کتێبخانەی گشتی بەرەوخوار دەبووەوە. جا سەروەختێک کە دەگەیشتە ناو باڵەخانەی کتێبخانە، یەکێک نەیزانیبا وای دەزانی کە بەرلەوەی بچێت لە ژوورەکەی خۆی لە فەرمانگە دابنیشێ دەچێت چاوێک بە هۆڵەکان یاخود ڕۆژنامەیەک یاخود کتێبێکدا دەگێڕێت و دەخشێنێت، بەڵام وا نەبوو، بەڵکو دەسبەجێ دەچوو بۆ توالێتەکە و خۆی خاڵیی دەکردەوە. پاش ماوەیەک دەگەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی بۆ لای ئێمە و خێرا زەنگی بانگکردنی کارگوزارەکانی لێ دەدا، کە زۆر کات حاجی غەریب دەهات بە پیر زەنگەکەیەوە. جا ساڵح دیلان بە دەنگێکی بەرز بانگی لە

حاجی غەریب دەکرد و پێی دەوت: ئەرێ ئەوە ئێوە خەریکی چین لەوێ دانیشتوون؟! بۆچی ناچن دوو تەنەکە ئاو بکەن بەو توالێتانەدا؟!

دواتر حاجی غەریب خۆی بۆیگێڕامەوە و وتی: کاک عەلی، ئەمەیش پیاوە نیشتمانپەروەرەکە، لەماڵی خۆیان دانانیشێ، بیر و خێرەکەی دەهێنێت بۆ ئێرە بۆ کتێبخانە دایدەنێت، ئینجا بانگیش لە ئێمە دەکات بچین ئاوی بۆ پێدا بکەین!

## خانووەکەی ڕوشدی ئەحمەد بەگ و تەلەفونەکەی من

لەدوای پێکهێنانی بەرە لەگەڵ بەعس لە ساڵی١٩٧٣دا، حیزبی شیوعی بەگەرمیی و بە وردیی بە شوێن خانوویەکدا دەگەڕا بیکات بە بارەگا بۆ خۆی لە سلێمانی، بەڵام دەستی نەدەکەوت. بەعسیش کە حکومەت بوو و دەیان خانووی حکومیی هەبوو لە شارەکەدا، ئامادە نەبوو خانوویەک بدات بە حیزبی شیوعی بە کرێ.

لەدوای هەوڵ تەقەللا و گەڕانێکی زۆر، خانوویەکمان لە گەڕەکی کانێسکان دەست کەوت، کە پشتی لە حامییەی سلێمانی کردبوو. خانووەکە خانووی ماڵی باوکی ڕوشدی ئەحمەد بەگ بوو، کە مامۆستایەکی خوێندەواری شار و کەسێکی ناسراوی شیوعی بوو، بۆ خوێندن چوو بوو بۆ مۆسکۆ. لەپاش دابینکردنی خانوو، ئینجا حیزب پێویستیی کەوتە هێڵێکی تەلەفون، بەڵام لە ترسی بەعس کەس زاتی نەکرد بچێت هێڵێکی تەلەفون بۆ حیزب وەربگرێت، من چووم بە ناوی خۆمەوە مامەڵەی تەلەفونێکم کرد و هێڵێکم بۆ وەرگرتن.

## مەکینەی ڕیشتاشینەکەی کاوەی ڕەئوف زوهدی

کاوە ڕەئوف زوهدی، کوڕێک بوو بە سیما شێتۆکە و کەمفام دەردەکەوت، بەڵام تا بڵێی کوڕێکی ژیر و قسەخۆش بوو. لەپاش ئازادبوونم لە زیندان لە مانگی دوازدەی ساڵی ١٩٩١، جار هەبوو کە سەردانی محەلی سلێمانیم دەکرد، لەوێ لە مقەڕ دەمبینی و هەر بە سەر پێوە هەندێک قسەمان دەکرد. جا کاوە لە هەندێک لە هاوڕێیانی محەلی نەک هەر قایل نەبوو، بەڵکو جوێنیشی پێ دەدان. کاوە خۆی بۆیگێڕامەوە و وتی لە ساڵانی حەفتادا مەکینەیەکی تەراشیی کارەبایم هەبوو کەم کەس لە سلێمانی هەیبوو، هەر بۆیە کەم کەس شتی وای بینیبوو، ڕۆژێکیان، لە داخی هەندێک لە ئەندامانی محەلی سلێمانی، بە دزییەوە مەکینەم هێنا بۆ مقەڕ و خستمە بن تایەی ئۆتۆمبێلێکی مقەڕەوە. کاتێک کە پاسەوانەکان ئەوەیان لە بن تایەی ئۆتۆمبێلەکەدا بینی، بەلایانەوە سەیر و سامناک بوو و بە بۆمبی چێنراوی تێگەیشتن، هەر بۆیە خێرا پەیوەندییان بە حامییەی سلێمانییەوە کرد تاکو تیمێک لە شارەزایانی سەربازیی هەڵگرتنەوەی بۆمب و تی ئێن تییان بۆ بنێرن. کاتێک کە تیمەکە گەیشت و لە دانراوی بن تایەکە وردبوونەوە و بە وریایی هەڵیانگرتەوە، تەماشا دەکەن مەکینەی تەراشیی کارەباییە!

## خولی فێرکردن و ڕاهێنان

لەدوای پێکهێنانی بەرە سیاسییەکەی نێوان حیزبی شیوعی و بەعس لە ساڵی ١٩٧٣، حیزبی شیوعی، کە لەوەتەی دامەزراندنییەوە لە ساڵی ١٩٣٤دا تەنها ماوەی نزیکەی پێنج

ساڵێک دوای شۆڕشی چواردەی تەمموز بە ئاشکرا کار و چالاکیی سیاسی کردووە ئیتر ماوەی هەموو ژیانی هەر بە نهێنیی و شاراوەیی تێکۆشاوە و خەباتی ژێرزەمینیی کردووە، دەرفەتێکی دیکەی بۆ خەباتکردن بە ئاشکرا و دوور لە ترسی دەستگیرکردن و بێسەروشوێنکردنی ئەندامەکانی لەلایەن دەزگا ئەمنی و پۆلیسییەکانی دەوڵەتەوە بۆ ڕەخسا. وەک دەڵێن حیزب ئاهێکی بە بەردا هاتەوە و بە هۆی دەستگیرۆیی حیزبە شیوعییەکانی جیهان و بەتایبەتی یەکێتی سۆڤیەتیشەوە بڕێک بووژایەوە و وردە وردە خەریکبوو خۆی دەگرت و دەکەوتە سەر پێی خۆی. بە مەبەستی پێشخستن و برەودان بە بنکە حیزبییەکان و ڕێکخستنەکانی و پێگەیاندنی کادر پەیتا پەیتا و پۆل پۆل دەستیکرد بە ڕەوانەکردنی هەندێک لە ئەندامەکانی بۆ دەرەوەی عێراق بە مەبەستی خوێندنی مارکسیزم لینینزم و بینین و تەواوکردنی خولی ڕۆشنبیریی و کادریی لەو قوتابخانانەی پێگەیاندنی کادراندا کە زۆربەی حیزبە شیوعییەکانی ئەورووپای خۆرهەڵات هەیانبوو. هاوکات لەگەڵ ئەم هەنگاوەی حیزبی شیوعیدا بەعسییەکانیش، لە بێئاگایی و بێخەبەریی شیوعییەکاندا، دەستە دەستە کادری ئەمنیی و پۆلیسییان ڕەوانەی ئەورووپای خۆرهەڵات دەکرد بەمەبەستی بەشدارییپێکردنیان لە خولی بارهێنان و مەشق و ڕاهێنان لە قوتابخانەکانی پێگەیاندنی جەللادان و ڕفێنەرانی مرۆڤ و پیاوکوژان لە قوتابخانە ئەمنییەکانی دەزگا پۆلیسییە سیاسییە نهێنییەکانی لە نموونەی ئیشتازی و ئێن کەی ڤی دی و نموونەی ئەو جۆرە دام و دەزگا داپڵۆسێنەرانەدا.

## مرۆڤێکی لاپرەسەن

جەلال عەبدولڕەحمان، کوڕی حاجی ئەوڕەحمانی خەیات بوو لە قەیسەری نەقیب، ماڵەکەیان لە پشتی سەرا بوو لای ماڵی سەعە دزکوژ، لە نەقابە مقاوەمەی شەعبی بوو، واتە لە سەرەتای سەردەمی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسمدا، ڕۆژێکیان لەگەڵ باوکم و ئەحمەد و ئەوڕەحمانی برام دەچووین بۆ عەربەت، کەسێکی خزممان کۆچی دوایی کردبوو، جەلال وەکو ئەندامێکی بزێوی مقاوەمەی شەعبی، لە سەیتەرەکەی عەربەت وەستابوو خەریکی خەڵک پشکنین بوو. ئەگەرچی جەلال ئێمە هەموومانی باش دەناسی، بەتایبەتی من و ئەحمەد و دەیزانی من لە نەقابەم، بەڵام لە پاسەکە دایگرتین و هەموومانی پشکنی، من و ئەحمەد یەکی چەکێکی سیمینۆفمان پێ بوو، جەلال لە پشکنینەکەدا بۆی نەدۆزرایەوە.

جەلال ئەوڕەحمان کەسێکی لاپرەسەن بوو خۆی لە زۆر شت هەڵدەقورتاند، لەپاش نەمانی مقاوەمەی شەعبی بوو بە موراقیبی شارەوانی، لە کاتی هەڵبژاردنی نەقابەی کرێکاراندا ناوی شەش حەوت کەسی لە سەر پارچە کاغەزێک نووسیبوو لە کاتی هەڵبژاردنی نەقابەدا دەگەڕا و بە دەنگدەرەکانی دەوت: دەنگ بەم ناوانە بدەن! من عوسمان بروسکەی هاوڕێم پێی وتم: کاک عەلی، جەلال کاغەزێکی پێیە ناوی کۆمەڵێک کەسی تێدایە ناوی تۆی تێدا نییە. ئەمە لە کاتێکدا کە من ناوم لە سەر ئەو بۆردەی نەقابە لە ڕیزی ناوی پاڵێوراوەکانی نەقابەدا نووسرابوو.

لە کۆتاییدا جەلال چووە پاڵ حکومەت، پێموایە دواجار بە ڕێخۆڵەکوێرە مرد.

## جەلالی تەڵا

حکومەتی بەعس بە وردی دەگـەڕا بە یاسا لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەجـووڵایـەوە کە پێی وا بـوو بێ یاسایی دەکـەن، ماوەیەک گەڕیان لە جەلالی تەڵای نانەوا ئاڵاند، کە بە نەژاد خەڵکی ئێران بوو، دەیانوت یان دەبێت بڕواتەوە بۆ ئێران، یان دەبێت ببێت بە بەعسی. ئەوکات سەعدوڵڵا فەیزوڵڵا کاکەیی، کە هاوڕێیەکی بەڕێزە لام، شیوعی بوو، بۆی گێڕامەوە و وتی: ئەمنی سلێمانی زیاد لە جارێک جەلالیان بانگکردووە بۆ ئەمن تاکو قایلی بکەن ئیشیان لەگەڵدا بکات، ئیتر ئەویش ناچار ئیشی لەگەڵ کردون.

ئەوەبوو دواجار لە ڕۆژێکی سەیر و سەمەرە و پڕ ڕووداو و تەمومژاویدا جەلالی تەڵا لە دووکانەکەی خۆی تیرۆرکرا.

## گەڕانەوە بۆ کارگێڕیی خۆجێیی

ساڵی١٩٧٨ کە لە کتێبخانەی گشتیی سلێمانی فەرمانبەر بووم، بە فەرمانبەریی گەڕاندمیانەوە بۆ کارگێڕیی خۆجێیی یاخود ئیدارە محەلی و لە ئیدارە محەلییەوە دوو کەسیان لە شوێنی من گواستەوە بۆ کتێبخانەی گشتی، یەکێکیان ناوی ئەحمەد عەلی حەیدەر بوو و کوردی خانەقینی بوو و سەر بە حکومەت بوو، ئەوی تریان ناوی بەکر ڕەحیم قازی بوو، گوایە بە ڕەچەڵەک هەورامییە و کوڕی مەلایەکە لە سەید سادق و هەم جەیشی شەعبی و هەمیش بەعسییە.

کاتێک کە گواستمیانەوە بۆ ئیدارە محەلی، پێیان وتم: شیوعی نابێت لە ڕاگەیاندنی بەعسدا ئیش بکات. لەپاش چەند

ڕۆژێک لە دەوام لە ئیدارە محەلی، ناردمیانە بەشی هەندەسە بە ناونیشانی فەرمانبەر/ نووسەر یاخود کاتب، چەند ڕۆژێک لە سەر ئیشەکەم بەردەوام بووم، ئەوکات ئیش و کارێکی زۆر و پڕۆژەیەکی زۆر لە شاردا جێبەجێ دەکرا، کێشەی ئەو کاتەی پارێزگای سلێمانی و کارگێڕیی سلێمانی بریتی بوو لە چیمەنتۆ و شیش بۆ پڕۆژەکان، منیش لە ژوورێکی بەشی هەندەسە خەریکی جیاکردنەوەی ئەو داوایانەی بەڵێندەرەکان و کەشف و خەرجکردنی پارە و داواکردنی شیش و چیمەنتۆ بووم. ڕۆژانە کە بەڵێندەرەکان کێشەی چیمەنتۆ و شیشیان هەبوو دەهاتنە لای من و پێشتریش منیان دەناسی، چونکە سەردەمانێکی زۆر کرێکاری و نەقاڕیم کردبوو لەگەڵیان. وەک ئەوەی بەڵێندەرەکان لە نێوان خۆیاندا پرسیاری ئەوەیان لە خۆیان کردبێت کە تەماشای ئەم فەرمانگەیە کێی داناوە بۆ شیش و چیمەنتۆ و کێیشیان داناوە ئەوراق جیادەکاتەوە؟

هەندێک لەو بەڵێندەرانەی ئەو کاتە کە ئێستایش ناوەکانیانم لە یاد ماوە، ئەمانە بوون: محەمەد حاجی ساڵح حەمامچی، مەحموود فەقێ حسێن، حەسەن وەستا عەزیز برای عەبەی عەزیز، حەمە کاکە، وەستا ساڵح نوری ڕەباتی. ئەم بەڵێندەرانە، کە لە نێوان خۆیاندا و لە بەر خۆیانەوە مقۆمقۆیان بوو و نەیاندەوێرا قسە لەگەڵ من بکەن، خۆیان کرد بە ژووری سەرۆکی ئەندازیاراندا. پاش بەینێک سەرۆکی ئەندازیاران کە جەلال عومەر بوو، لەگەڵیان هاتە دەرەوە و چوون بۆ لای یاریدەدەری پارێزگار کە هیدایەت عەبدولڕەحمانی خەڵکی کارێزەی لای کفری بوو. لەدوای نزیکی کاتژمێرێک بانگیانکردم

بۆ لای یاریدەدەری پارێزگار، وەک وتم من تازەکی گەڕابوومەوە بۆ ئیدارە محەلی، هەر بۆیە هیدایەتم نەدەناسی، لەبەرئەوەی ئەو دام و دەزگایەی کە سەر سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، ئیدارەیان جێهێشت.

یاریدەدەری پارێزگاریش خەلیل ئەسکەندەری بانگ کرد، لەگەڵ بەڕێوەبەری کارگێڕیی کە قادر ساڵح ژاژەڵەیی بوو، لەگەڵ بەڕێوەبەری ژمێریاری، داوای لێ کردم و وتی: ئێستا نووسراوی بڕیارێک دەنووسین، ئەو ڕۆژە بە ڕێکەوت ڕۆژی ٣٠ی مانگی ئابی ساڵی١٩٧٨بوو، عەلی حامید، فەرمانبەر لە بەشی هەندەسە لە ئەمڕۆوە دەبێت بە لێپرسراوی وەرگرتنی چیمەنتۆی ئیدارە محەلی، لەگەڵ وەرگرتنی شیشی پێویست لە کەرکووک هەموو ڕۆژانێکی یەکشەممەی هەفتەکە، ئەم بڕیارە بە واژۆی پارێزگار جێبەجێ کر و وێنەی نووسراوەکە نێردرا بۆ وەزارەتی پیشەسازی و وەزارەتی بازرگانی و هەموو فەرمانگە پەیوەندیدارەکانی تری شاری سلێمانی.

بەر لە من ئەو لێپرسراوییە لای ڕەشید مام غەریب بوو، دەوترا ڕەشید کەین و بەینی زۆرە و یاری بە چیمەنتۆ دەکات، منیش لە بەر چاوی ئەو بەڕێزانەی کە لە ژوورەکەدا بوون، بە یاریدەدەری پارێزگارم وت: ببوورە، ئەم ئیشە هینی من نییە و من شان نادەمە بەر ئیشی لەو جۆرە، ڕاستە من فەرمانبەری میریم و هەرچییەکم پێ ڕابسپێرن ناچارم کە بیکەم، ئەمە ئیشی کەسێکی ماستاوچییە و بۆ من دەست نادات. بەڵام ئەوان وتیان ئەوە فەرمانە و ئەملاو و لای تێدا نییە و هەر دەبێت جێبەجێی بکەیت.

لەپاش ئەوە بڕیارەکە خرایە بواری جێبەجێکردنەوە، ئیدارە محەلی ئۆتۆمبێلی تایبەتیان بۆ تەرخانکردم و ڕێژەی ١٢٪ یان خستە سەر مووچەکەم. منیش بۆ سبەینێکەی دەسبەجێ چووم بۆ کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار بۆ بەشی چیمەنتۆکەی ئیدارە محەلی، کە ڕۆژانە ٧٢ تۆن بوو بە سێ بارهەڵگری هەژدە تۆنی دەگوازرانەوە. سبەینێکەی کاتژمێر حەوت لە سەرچنار بووم، ئەوکات وەزارەتی بازرگانی چیمەنتۆکەی دابەش دەکرد، کاتێک کە چوومە ژووری دابەشکردنی چیمەنتۆ، مستەفا ئەحمەدی هونەرمەندم بینی، ئەو هونەرکارەی کە ڕۆژ تا ئێوارە بە تەنز و نواندن و هونەرەکەی ڕەخنەی کەموکووڕیی و خواروخێچییەکانی کۆمەڵ دەکات، لە حەوت تاکو دەی سەرلەبەیانی من چاوەڕێی وەرگرتنی بەشە چیمەنتۆکەی ئیدارەی محەلی بووم، کاک مستەفا لە دەرگاکەوە تێی دەتەقاند بۆ دەرەوە بۆ چایخانەکەی کارگەی چیمەنتۆ لەوێوە بۆ بازاڕی یاریکردن بە چیمەنتۆ، لە کاتێکدا کە لە بەر دەم کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار ئینزیباتی عەسکەریی و ئەمنیشی لێیە. منیش کە ئەم فرت و فێڵەم بینی سووک و باریک لەگەڵ ئۆتۆمۆبێلەکەی فەرمانگەکەم گەڕامەوە بۆ لای یاریدەدەری پارێزگار و ئەو ئەوراقانەی کە پەیوەندیی بە کاروبارە تازەکەمەوە هەبوو لەگەڵ نووسراوی دامەزراندنەکەم لەو شوێنە هەموویم خستە سەر مێزەکەی هیدایەت عەبدولڕەحمان و پێم وت: من پێشتر بە بەڕێزتم وت کە ئەمە ئیشی من نییە، من لە کاتژمێر حەوتەوە لە سەرچنارم، مستەفا ئەحمەد لە بەر بازاڕی یاریکردن بە چیمەنتۆ بەشەکەی ئیدارە محەلیم ناداتێ، ئەوەی لە کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار

هەیە کەربازاڕییە، مستەفا لە دەرگاوە دەچێتە دەرەوە و لە پەنجەرەوە دێتە ژوورە ئەوەندە بازاڕی گەرمە، هەر لە پێش دەرگای کارگەکەوە تا بەشی تێکردن و کێشان کۆمەڵێک کەس لەو کارگەیەن هەموویان شەریکە دزن، من پێم وتی ساختەچێتی بە من ناکرێت!

هیدایەت عەبدولڕەحمان بە بیستنی ئەمە زۆر ناڕەحەت بوو، دەسبەجێ بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ بەڕێوەبەری وەزارەتی بازرگانی کرد کە فەرمانگەکەیان بەرانبەر بە نەخۆشخانەی کۆنی سەرەوە بوو و پێی وت هەر خێرا وەرە بۆ ئێرە. من لەو کاتەدا لای هیدایەت دانیشتبووم، کاتێکم زانی بەڕێوەبەری وەزارەتی بازرگانی هات بۆ لای یاریدەدەری پارێزگار و وتی: فەرموو کا هیدایەت ئیشت بە من هەبوو؟ هیدایەت وتی: گوێ لە عەلی بگرە بزانە دەڵێ چی؟ منیش بەسەرهاتەکەم بۆ بەڕێوەبەر گێڕایەوە، ئەویش دەسبەجێ هات لەگەڵم و چووین بۆ لای مستەفا ئەحمەد بۆ کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار، کاتێک گەیشتینە لای مستەفا، مستەفا وتی: کاک عەلی ئەوە شکاتت کردووە؟! وتم: بەڵێ شکاتم کردووە، چونکە ئەوەی کە من لێرە لەم کارگەیە دەیبینم ساختەچێتییە و ساختەچێتی بە من ناکرێت. مستەفا ئەحمەد، بە بەر چاوی بەڕێوەبەری وەزارەتی بازرگانییەوە وتی: بۆ تازە بەم ساختەچێتییەت زانیوە؟! بەڕێوەبەر پێی وت: ڕۆژانە بەشی ئیدارە محەلی چەندە بەبێ کەموکووڕیی و دواکەوتن دەیدەیتێ. مستەفا ئەحمەدیش پێی وتم: کوا بەڵێندەرەکەت؟ منیش ئەو ڕۆژە بە هیچ بەڵێندەرێکم نەوتبوو بێت بۆ سەرچنار، چونکە پێموابوو کە ئەوان خۆیان دێن بۆ ئەوێ، هەر لەوێ چاوم گێڕا

بەڵێندەرێکی لێ بوو ناوی سابیر بوو، ئەو پڕۆژەیەی کە ئەو وەریگرتبوو چواردە خانوو بوو بەرانبەر بە نەقلیاتی بەغدا لای مەعرەزەکان، بانگم لە سابیر کرد، هەر سێ لۆرییەکە کە ٧٢ تۆن چیمەنتۆکەیان دەگواستەوە، دام بە سابیر. سابیر ئامۆزای ڕەشەی مام غەریب بوو کە لایانبرد و منیان لە شوێنی دا نا، چووزانم کابرایەکی ساختەچی و فێڵبازە. ئیتر من گەڕامەوە بۆ فەرمانگەکەم و بە نووسراوێک کارەکەم خستە بەر دەستی هیدایەت، هیدایەت کاتێک کە چاوی بە ناوی سابیر کەوت لە سەر نووسراوەکە کە ٧٢ تۆن چیمەنتۆی وەرگرتووە، بەپەلە بانگی ئەندازیاری پڕۆژەکەی سابیر کرد و خێرا پەیوەندییان بە پۆلیس و ئەمنەوە کرد کە سابیر دەستگیر بکەن و بیهێنن، سابیریش ڕێوی بوو، ئیشی خۆی دەزانی و نەبوو بە تەڵەوە، کەوتنە لێکۆڵینەوە لەگەڵ من.

لەبری لێکۆڵینەوە لە ساختەچێتی و فرت و فێڵ و کەربازاڕییەکەی کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار، لێکۆڵینەوە لەگەڵ عەلی حامید کرا کە چۆن و بۆچی ٧٢ تۆن چیمەنتۆت داوە بە سابیر؟! منیش ڕووداوەکەم بۆ ڕوونکردنەوە و وتم: بەڵێندەرەکان کە سەرەیان بوو، لەو هەڵوێستەی مستەفا ئەحمەد کە چیمەنتۆکەی ئیدارە محەلی نەدا پێم، من گەڕامەوە بۆ لای تۆ، لەم بەینەدا هیچ بەڵێندەرێک لە کارگەکە نەمابوون، منیش چووزانم ئەمە چ جامبازێکە بانگم کرد و چیمەنتۆکەم دا بە ئەو، بۆ ڕاستیی قسەکانم ئامادەم ڕووبەڕووم بکەنەوە لەگەڵ سابیر. ئەوەبوو سابیر بۆ ماوەی هەفتەیەک دەستگیرکرا، هیوادارم لەدوای ڕاپەڕین ئەو دەستگیرکردنەی بە خەبات و دەستگیرکردن

له سەر سیاسەت بۆ ئەژمار نەکرابێت بەو جۆرەی کە بۆ زۆر کەسی تر ئەژمار کرا.

سابیر سێ لۆری چیمەنتۆکەی شاردەوە و کەس نەیزانی چی لێ کرد! ئەمە تەنها ڕووداوێکی بچووکی گەندەڵی و دزی و فزییەکانی کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار بوو، کە مستەفا ئەحمەد فەرمانبەری بوو و سابیر بەڵێندەری بوو.

## دۆخی حیزبی شیوعی لە سلێمانی لەساڵی١٩٧٨دا

ساڵی١٩٧٨ پەیتا پەیتا لە هەموو عێراقدا حکومەتی بەعس تەکی بە شیوعییەکان هەڵچنی، کێ گیرا گیرا و کێ بەربوو بەربوو و کێ تۆببەی کرد کرد یان تۆببەی لە شیوعی کرد و بوو بە بەعسی کردی.

ئەو کات من ئەندامی لیژنەی شاری ڕێکخراوی حیزب بووم لە سلێمانی، نەورۆز سدیق شاوەیس لێپرسراو بوو، ئێمە لەم هاوڕێیانە پێکهاتبووین: دکتۆر سدیقی چاوەکە، وەک پێشتریش لە شوێنێکی تردا وتم باوی ناو کۆمەڵی ئێمە بەو جۆرەیە کە بە یاریدەدەری پزیشک و برینپێچیش هەر دەڵێین دکتۆر، عومەر ئەحمەد مەساح لە ئیدارە محەلی، مامۆستا یوسف کە کریستیان بوو و ماڵەکەیان لە بەر دم دەرگای ئامادەیی سلێمانی کوڕان بوو لە گەڕەکی چوارباخ، مامۆستا شێخ عەلی سەرسپی قادرکەرەمی کە ئەمیش هەر دیسان ماڵەکەیان لای ماڵی مامۆستا یوسفەوە بوو، مامۆستا سەلاح کە لە ساڵی١٩٨٨ لە شیوی قازی لە قەرەداغەوە هێنرایەوە و لەوبەر تانجەرۆوە لە بەر دەم گوندی کانیی سپیکە دایان بە گرت و کەوتە ناو قوڕگی

ئاشی ئەنفالەوە، مامۆستا شەوکەت کە بەداخەوە کەمئەندام بوو و ماڵیان بەرانبەر بارەگای حیزب وو لە کانێسکان و باوکی کاتی خۆی بەڕێوەبەری تەجنیدی سلێمانی بوو.

ئاگادارکراین کە کۆبوونەوەیەکی کتوپڕمان هەیە دەربارەی ئەم بارودۆخە سیاسییەی کە ئەمڕۆ عێراقی پیادا تێپەڕ دەبێت، وتیان مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب دێت بۆ کۆبوونەوەکە. هەر لە سەرەتاوە پێمانیان وت: نابێت زۆر قسە و پرسیار بکرێت! منیش لەبەرخۆمەوە وتم: کەواتە کۆبوونەوە بۆ چی دەکرێت! من هەر پرسیارێک بە مێشکمدا بێت دەیکەم.

بە کورتی و بەبێ ئەوەی بە قووڵی بچێتە ناو بارودۆخە سیاسییە ئاڵۆزەکەوە مەلا ئەحمەد باسی ئەوەی کرد کە حیزبی شیوعی لە عێراق چی بە سەر هاتووە و بەرەو کوێ هەڵیدەبڕن و پەنا و پەسێومان لە کوردستان و عێراق کوێیە تاکو بتوانێت خۆی تێدا ڕێکبخاتەوە و کۆبکاتەوە. ماوەیەکی زۆر پێش ئەم کۆبوونەوەیە عەزیز محەمەدی سکرتێری حیزب ڕێنمایی ئەوەی پێداین شیوعییە کوردەکان بچنەوە ناو کۆمەڵ و تێکەڵ بە کەس و خزمانی خۆیان ببنەوە، هەر کەس بۆ سەر جێ و ماڵ و حاڵی خۆی. بە قسەوباسی ناو کۆبوونەوەکەدا ئەوە دەرکەوت کە پارتی خۆی کۆکردووەتەوە و برینەکانی سارێژ دەکاتەوە، لەملایشەوە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە ساڵانێکە دامەزراوە، ئەو شوێنانەی کە پێشتر هێزی پێشمەرگەی پارتی تێدابوون ئەم چووەتە ناویان، ئیتر پرسیاری ئەوە هاتە پێشەوە کە حیزبی شیوعی ڕوو لە کوێ بکات؟

هـەر لـە سـاڵانـی حـەفـتـاوە، کـە حـیـزب سـوور دەیـزانـی بارودۆخە سیاسییەکە بەرەو تێکچوون دەچێت، حیزب بیری لەوە کردبووەوە، بەتایبەتی لەدوای حەفتا و چوارەوە و بەر لە دروستبوونی یەکێتی، لەو شارەزوورە شتێک پێکەوە بنێن، بۆ ئەو مەبەستەیش جارێکیان بەهادین نوری بەتایبەتی لە بەغداوە هات بۆ سلێمانی و بە یاوەریی چەند هاوڕێیەک، پێموایە یەکێک لەوانە حەمە سۆیلە قەرەچەتانی بوو، سەردانی هەڵەبجە و شارەزوو و سەید سادق و ئەو ناوچانەی کرد، بەڵام بێ ئەنجام بوو.

وەک وتمان حیزبی شیوعی جێی بۆ نەمابوو، نە لە عێراق و نە لە کوردستان، کەواتە پێویستە چی بکات؟ حیزب بڕیاریدا بەشێک لە ڕێکخراوەکان بکرێن بە ڕێکخراوی نهێنی، ئەو هاوڕێیانەی ناسراون لە ڕێکخراوەکان دووریانبخەنەوە، یان ئەگەر توانی با خۆی بشارێتەوە. هەڵبەتە ئەم بڕیارە نەیتوانی ڕیزەکانی حیزب لەو هێرش و پەلاماری گرتن و ڕاوەدوونانە بپارێزێت کە حیزبی بەعس نیازی بوو دەستی پێ بکات. وردە وردە بەعس لە ڕێگای ئەمنی سلێمانییەوە دەستیانکرد بە بانگکردنی ئەو هاوڕێیانەی کە ناسراو و لە بەر چاو بوون، لە نموونەی دکتۆر سدیقی چاو، ئەحمەد مارفی نانەوا، عومەر عەلی کەماڵانی، سەید باقی، مامۆستا سەلاح، هەموو ئەوانەی کە لێپرسراوییان هەبوو خۆیان شاردەوە.

هەروەها هەندێک لە هاوڕێیانی تریش کە لە ناو فەرمانگە و لە سەر کار و ئیشەکانیان ناسراو بوون، لە نموونەی کاک جەبار لە فەرمانگەی مەلاریا، فەرەج وەلی لە بەرید، سەعدوڵلا

که نوێنەری حیزب بوو. مایەوە سەر ئەوەی بڵێین هەندێک لە خوێندکارانی زانکۆ و هەندێک لە هاوڕێ دێرینەکان، لە ناو هەموویشیاندا من خۆم، کە دیار و لە بەر چاو بووم، پرسیاری ئەوەم کرد ئاخۆ کەسێک کە بە ڕێپێدان و مۆڵەتی ئەمن دەمانچەی هەڵگرتووە و کلاشنیکۆفی سۆخۆی پێیە و لە فەرمانگەیەکی میری ئیش دەکات کە پێشتر کتێبخانەی گشتی بوو و ئێستا گواستراوەتەوە بۆ ئیدارە محەلی، ئەگەر بانگ بکرێت بۆ ئەمن دەتوانێ بەو هەموو بەڵگەیەوە بڵێ: من شیوعی نیم!؟ بەڵام ڕێکخەرانی کۆبوونەوەکە هیچ وەڵامیان نەدامەوە.

کاتێک کە هەڵمەتی دەستگیرکردنەکە دەستی پێ کرد و بانگکرام بۆ ئەمن، لە ئەمن لیژنەیەک دروست کرابوو بە ئەندامیتی ئەندامێکی کورد کە کەمال پشدەری بوو. کەمال پشدەری وتی کۆمەڵێک پرسیارت لێ دەکەین و ڕاست بڕۆ. وتم فەرموو. وتی: ئەو ژوورە دەبینی؟ وتم: بەس دەرگاکەی دەبینم. وتی: ئەوە ژووری تێهەڵدان و فەلاقەکردنە. با لێرەدا باسی ئەوەتان بۆ بکەم ئەو ڕێکخراوەی کە لای من بوو لە گەڕەکی گۆیژە و مەڵکەندی، کاک جەبار و فەرەج وەلی کاتێک کە پێش من بانگکرابوون بۆ ئەمن و بیراز کرابوون، ناوی منیان دابوو بە ئەمن، وتبویان عەلی حامید لێپرسراوی ڕێکخراوەکەمانە. کەمال پشدەری وتی: تۆ پەیوەندیت لەگەڵ حیزبی شیوعی هەیە؟ وتم: بەڵێ. وتی: چۆن دەڵێیت بەڵێ؟ وتم: من بە مۆڵەتی دام و دەزگای پۆلیس و ئەمنی ئێوەی حکومەت ناسنامەی چەکم بۆ کراوە و کلاشنیکۆف و دەمانچەم هەیە چۆن دەتوانم حاشا لەوە بکەم؟ ئێوە خەڵکتان گرتووە ناوی منیان داوە پێتان، ئەوانە هەمووی بەڵگەن لە سەر

من. لێرەدا پرسیارەکانی کەمال پشدەری کۆتاییان هات و باش بوو ئەمن مۆڵەتیاندام و وتیان بڕۆ.

ئەو سەردەمە عومەر حامیدی برام هەموو ڕۆژێک دەچوو بۆ کەرکووک لەوێ هەفتەنامەی بیری نوێ (الفکر الجدید) و ڕۆژنامەی (طریق الشعب)ی حیزبی دەهێنا بۆ سلێمانی، ڕۆژێکیان ئەمن لە تاسلۆجە بۆی دانیشتن گرتیان تێر و پڕیان کوتا. لەدوای ئەوە بە چەند ڕۆژێک دیسان چووەوە بۆ کەرکووک بۆ هاوردنی ڕۆژنامە، بەڵام هەواڵی ئەوەی زانیبوو کە ئەم جارە بە تێهەڵدان ڕزگاری نابێت، ئیتر خۆی شاردەوە و وازی لە ئیشەکەی هێنا.

هێدی هێدی شیوعییەکان لە سلێمانی تەنگەتاوکران و تەنگیان پێ هەڵچنرا، ئەو کات ئێمە لێپرسراوەکەمان نەورۆز شاوەیس بوو، حیزب گۆڕییان و مەلا بەکریان لە شوێنی دا نا کە خەڵکی هەولێر بوو و لە سلێمانی نەناسراو بوو، بەڵام مەلا بەکریش هەر شاراوە بوو و بە نهێنی یاخود بە دزییەوە جموجوڵی دەکرد و هەڵدەسوڕا و کاری حیزبی جێبەجێ دەکرد.

لەو کات و سەردەمەدا کۆمەڵێک خەڵکی دڵسۆز و باش هەبوون لە سلێمانی وەک دۆست و لایەنگر پەیوەندییان بە حیزبەوە هەبوو لە ڕێگای منەوە و هیچیان ئەندام نەبوون، لە نموونەی ئەو کەسانە: حەمەی محێدین دارتاشلای بازاڕی زێوەر، حەمەی حاجی ساڵح بەڵێندەر، وەستا ئەسعەد حەمەساڵح ڕەباتی بەڵێندەر، ساڵح نوری ڕەباتی، ئەنوەر حاجی ڕەزا قەرەداغی دووکانەکەی لە شەقامی گۆران بوو بەوبەر ئۆرزدیباکەوە لەلای سەرەوە، عوسمان بروسکەی بەڵێندەر

له خوار شەقامی گۆران، سمایلی حاجی سەعیدی حەڵواچی، کامیلی حاجی سەعیدی حەڵواچی لە شەقامی کاوە لە نزیک ئەسحابەسپی، وەستا محەمەدی دارتاش ڕەباتی لە ڕۆژئاوای مزگەوتی خانەقا، ئەنوەر نەریمان ئاسنگەر لە نزیکی وەستا محەمەدی دارتاش، کەمال دەباغ لە مەیدانی ماستفرۆشان ئاشی هەبوو، قالە سووری خەیات لە قەیسەریی محە دگل، ئەحمەد قۆپچە لە دەرگای قەیسەری محە دگل، حاجی ئەمینی کانێسکانی خزمی جەلال دەباغ، نوری لۆقنتەچی لە مەیدانی ماستفرۆشان، مەحموودی عەبەی خوێ لای قەیسەری نەقیب، حەمەی وەستا حەمەومینە خێلی بەننا، ڕەئوف مەعروف خاوەنی کتێبخانەی گەلاوێژ لە شەقامی مەولەوی بەرانبەر بازاڕی عەسری، ئەم کۆمەڵە کەس و دۆستە، لە بۆنە و یادەکاندا و بەبێ هیچ بۆنە و یادێک گەلێک جار مانگانە هەریەکەیان بە خواستی خۆیان بڕێک چەندیان پارە وەکو یارمەتی دا بە حیزب، من بە دڵسۆزی و دەستپاکییەوە گەیاندومەتە حیزب لە شاخ، چ لە قەرەداغ و چ لە ئەحمەدئاوا و لە شارەزوور و بۆ ئەمانیش لە ناو شار هەواڵ و دەنگوباس و سیاسەتی ڕۆژ و سەردەمی حیزبم بۆیان باس کردووە و گێڕاوەتەوە.

دەتوانم بڵێم تا ساڵی١٩٨٧ و پێش شاڵاوی بەدناوی ئەنفال، من ئەو یارمەتی و کۆمەکەی ئەوانم بەردەوام گەیاندووەتە حیزب لە دەرەوە لە شاخ، هەر لەو کاتەوە کە ڕێکخراوەکانی حیزب لە ساڵی١٩٨١دا چوونە دۆخی نهێنییەوە و هەموو ئەندامانی محەلیی سلێمانی، هەر لە نەورۆز شاوەیسەوە بیگرە تا بە مەلا بەکر هەولێری و مامۆستا کەمال حەمەئەمین و عوسمان کەریم

چاوشین و عەبدولڕەحمان محەمەدی ناسراو بە ئەوڕەحمانی حەمە مردوو و خدر ناوێک کە لە زانکۆی سلێمانی بوو و گەرمیانی بوو و مامۆستا ساڵح هەورامی و مامۆستا تایەر هەورامی و کەمال مارف مەجید چوارتایی و ئەحمەد مەعروف نانەوا و قومری خانی خێزانی مەحموودی دەلاک و عەباس ڕۆستەم لە ئەشغالی سلێمانی و یاریدەدەرێکی پزیشک خۆی و خێزانەکەی کە خەڵکی چەمچەماڵ بوون تا بە نائیب عەبدوڵڵا دەگات کە لێپرسراوی محەلی ئەوکاتی سلێمانی بوو، هەموویان دەستگیرکران.

سێ مانگی تەواو مەلا بەکر خۆی و خێزانەکەی کە خەڵکی ڕانیە بوو و کوڕە بچکۆلانەکەی کە ناوی هیوا بوو، لەماڵەکەی من لە گەڕەکی گۆیژە میوان بوون و لە چاوی ئەمن خۆیان شاردبووەوە، تا ئەو کاتەی حیزب بە نهێنی خانوویەکی بۆ پەیداکردن.

## دەربارەی دەستگیرکردنەکەی محەلی لە ساڵی١٩٨١

لەپاش دەستگیرکردنی ئەندامانی محەلیی حیزب لە سلێمانی لە ساڵی١٩٨١، حیزب، لە ناو شار، بێ بەرپرس یاخود بێ سەکردە مایەوە. بەیانییەک کاتژمێر حەوت چووم بۆ بازاڕ، لە بەر دەرکی سەرا ڕێکەوتی ڕەئوف مەعروفم کرد کە دەچوو بۆ دووکانەکەی، چووم لەگەڵی دەڕابەی دووکانەکەم هەڵدایەوە، وتی وەرە ژوورەوە دانیشە شتێک هەیە با بۆتی باس بکەم.

ڕەئوف مەعروف وتی: ئەمشەوی ڕابوردو ئەمنی سلێمانی نائیب عەبدوڵلایان دەستگیرکردووە، نائیب ئەوکات لێپرسراوی

نهێنی سلێمانی بوو حیزب بوو، منیش وتم: بڕواناکەم، ڕەئوف وتی: با بڕوا بکە. لای ڕەئوف مەعروفم جێهێشت و چووم بۆ ئەسحابەسپی بۆ دووکانەکەی ئەحمەدی چایچی، قڕگەییەکان بەردەوام هاموشۆی چاخانەکەیان دەکرد، منیش بۆ ئەوە چووم تاکو بزانم کاکە حەمەی قڕگەیی هاتووە بۆ چاخانەکە تا هەواڵێک بزانم، ڕێکەوت کاکە حەمە لەوێ بوو، ئیتر لێم پرسی چی ڕوویداوە؟ وتی: نائیب شەو هات بۆ قڕگە، منیش ئەودیوم کرد. ئینجا چوومەوە بۆ لای ڕەئوف مەعروف و پێم وت: نائیب شەو خۆی گەیاندووەتە قڕگە و دەرچووە. لەپاش نزیکەی ساڵ و نیوێک و لەدوای بەربوونی ئەو هاوڕێیانەی کە ئەو کاتە دەستگیرابوون، بیستمەوە مەلا بەکر، کە ماوەیەک لە ماڵی من لە چاوی ئەمن خۆی شاردبووەوە، بە نامەیەک ڕووداوی دەستگیرکردنەکەیانی بۆ حیزب ناردبوو و ڕوون کردبووەوە. مەلا بەکر بۆ حیزبی نووسیبوو: ئەو ماڵەی کە لە سلێمانی منی تێدا بووم، تەنها دوو کەس دەیانزانی، ئەو دوو کەسەیش یەکێکیان نائیب عەبدوڵڵا و ئەوی تریان نەورۆز شاوەیس بوو. مەلا بەکر لە نامەکەدا دەڵێ: ئەو دوو کەسە ئێمەیان بەگرتداوە.

## تێهەڵدانی خەڵک

دەهەی حەفتا، کە نائیب عەبدوڵڵا لێپرسراوی سلێمانی حیزب بوو، جارێکیان نائیب بانگی کردم بۆ بارەگای حیزب کە لە گەڕەکی کانێسکان بوو، دوو بە دوو دوواندمی و وتی: سێ ناو هەن، بەڵکو بتوانیت بە هۆی ئەو هاوڕێیانەوە کە لای خۆتن لە ڕێکخراوەکەت، دارکارییەکی باشی هەرسێکیانم بۆ بکەیت.

ئەو سێ کەسە یەکێکیان لە فەرمانگەی ئاوی سلێمانی بوو، یەکێکیان مامۆستا بوو، ئەوی سێیەم چێشتخانەی هەبوو لە ئەسحابەسپی.

نائیب وتی: ئەوەی فەرمانگەی ئاو ڕۆژانە دەیان جوێنی ناشیرین بە بەهادین نوری دەڵێ، لەو کاتەدا فەرمانگەی ئاو بەرانبەر بە مزگەوتی گەورە و بەرانبەر پەروەردەی سلێمانی بوو. کاتێک کە گەڕامەوە بۆماڵەوە کە ماڵەکەمان لە گەڕەکی گۆیژە بوو، بە شەقامی سابوونکەراندا سەرکەوتم و لە دووکانەکەی عوسمان عەلی وێڵەدەری لامدا. عوسمان هاوڕێیەکی دێرین و ئازای حیزب بوو. وتم: حیزب بۆ ئیشێک ڕایسپاردوین و من و تۆ و عوسمان ڕەشید چاوشین پەنچەرچی لە سەر کارێز بۆ ئەنجامدانی ئەو ئیشە دەستنیشانکردووە. عوسمان وتی: ئیشەکە چییە؟ وتم: حیزب ناوی سێ کەسی داوە پێم و دەڵێ بەڵکو بتوانن برێک شەقم لەم سێ کەسە بۆ هەڵبدەن. عوسمان وتی: کاک عەلی، من گەلێک ئیشی لەو جۆرەم کردووە، با بۆتی بگێڕمەوە. منیش نەمهێشت عوسمان دەست بە گێڕانەوەی ئیشەکانی بکات و پێم وت: نا کاک عوسمان گیان، نەکەیت بۆ منی بگێڕیتەوە، کێ دەڵێ سبەینێ لای ئەم و ئەو نایگێڕمەوە و تووشی کێشەت ناکەم؟! ئیتر عوسمان بێدەنگ بوو. ئینجا وتم: ئێستا دەچم بە عوسمان ڕەشید چاوشین پەنچەرچیش دەڵێم، بەڵام ناوەکانتان پێ ناڵێم کە کێن و کێ نین تا ئەو کاتەی کە خۆم بە وردی دەچمە بنج و بنەوانیان.

دووراو دوور خۆم تاقیبی هەرسێ کەسەکەم کرد، چووم بۆ فەرمانگەی ئاو و کەسەکەم ناسی کێیە، پاشان ئەو کەسەی

که له ئەسحابەسپی چێشتخانەی هەبوو چووم بۆ لای سمایلی حاجی سەعیدی حەڵواچی و کامیلی برای و وتم: ئێوە ئەم ناوە دەناسن؟ وتیان: بەڵێ، ئەوە خاڵی ئێمەیە. ئیتر من هیچم نەوت. ئینجا شوێن پێی مامۆستاکەم هەڵگرت کە کەسی سێیەمی سێ ناوەکە بوو کە نائیب دابووی پێم، پرسیارم کرد وتیان: ئەمە خوشکەزای عارفی خەیاتە سەرشەقامی، لەو کۆڵانەی لە خانەقای حاجی مەلا عەلییەوە دەچێت بۆ لای ماڵی نامیق ئاغا، منیش بۆ ئەم کەسەیشیان هەر دیسان هیچم نەوت و بێدەنگ بووم.

لەدواییدا چوومەوە بۆ لای عوسمان وێڵەدەری، عوسمان وتی: پێویست ناکات بە عوسمان ڕەشید بڵێیت، بەس پیشانی خۆمی بدە ئیتر تۆ هەقت نەبێت من خۆم دەردیت بۆ دەرمان دەکەم، شەرتبێت بە یەک سیخوڕمە تەختی ئەرزی بکەم. چارەک بۆ دوو پێکەوە لەگەڵ عوسمان چووین بۆ لای فەرمانگەی ئاو، کابرام بینی لە فەرمانگەکە دابەزی و بەرەو کانێسکان بەرەوخوار بووەوە، پاش ئەوەی چەند هەنگاوێک ڕۆیشت و گەیشتە کۆڵانەکەی بەر دەم ماڵی شێخ لەتیفی شێخ مەحموود و لەوێوە لایدا و لە شەقامەکەوە نەڕۆیشت، ئێمەیش بە کۆڵانەکەدا شوێنی کەوتین، کە زانیم کەس دیار نییە هەر لە دووریی چەند هەنگاوێکەوە بانگم لە کابرا کرد، هێشتا لە بانگەکەم نەبووبوومەوە عوسمان کابرای تەختی ئەرز کرد. کابرا دەستی کرد بە هاوارکردن. من کاتێک کە نائیب ناوی ئەم زەلامەی داپێم وتی: نەکەی پێی بڵێی لە سەر جوێندان بە بەهادین نوری تێتهەڵدەدەین. کاتێک کە عوسمان کەوتە وێزەی کابرا و دای بە

ئەرزدا، من چوومە بن سەری کابرا و بە دەنگی بەرز پێم وت: نەخەڵەتابێتی جارێکی تر جوێن بە بەهادین نوری بدەیت! پاشان وازمان لێ هێنا و گەڕاینەوە بۆ ناو بازاڕ بۆ بەر دەمی شارەوانی، لەوێ تووشمان بوو بە تووشی جەمالی وەستا عەزیزەوە لای دووکانەکەی عەریف مەجید. لەوێ عوسمان وێڵەدەری لەگەڵ وەستا جەمالی بەننا پێی وتم: زەلامێک هەیە لە قەیسەری قیروان بەیارمەتی خۆت ئێمە دەچین چینێکی دەکوتین. منیش وتم ئەگەر مۆڵەت لە من وەردەگریت من ناتوانم مۆڵەتت بدەمێ، من ناتوانم لەو ناوانە دەربچم کە بۆم دەستنیشانکراون. بێجگە لەوە من خۆم هەر لە بنەڕەتدا لەم سیاسەت و هەڵسوکەوتە ناڕازیم، ئێمە وەکو حیزبی شیوعی چیمان بۆ ئەم میللەتە کردووە تا بچینە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە لە خەڵک هەڵدەدەن و خەڵک دەکوژن؟! بۆیە من بە هیچ شێوەیەک ڕازی نیم. عوسمان وتی: باشە کێشە نییە، من خۆم لەگەڵ وەستا جەمال دەچم.

چوو بوون بۆ قەیسەرییەکە، شەڕێکیان کردبوو لەدواییدا گەیشتەوە بە گوێی حیزب، ئەو کات سەعدوڵڵا نوێنەری حیزب بوو لە حکومەتدا، لەگەڵ حکومەت چوونە سەر ڕووداوەکە، وتیان: عوسمان وێڵەدەری پەیوەندیی بە عەلی حامیدەوە هەیە، ئیتر بانگیانکردم بۆ مقەڕ بۆ کانێسکان بۆ لای نائیب. نائیب وتی: باشە کێ بە تۆی وت ئەو شەڕەی قەیسەریی قیروان بکە؟ وتم: حیزب وتی. وتی: حیزب کێیە؟ وتم: حیزب خۆمم. وتی: یانی چی تۆ حیزبیت؟ وتم: ئەی یانی چی تۆ حیزبی و خەڵک دەنێریت لەم و لەو بدەن؟! نائیب لە داخاندا سەری هەڵگرتووە و لە ژوورەکە چووە دەرەوە.

دوو کەسەکەی تر، واتە مامۆستاکە و خاوەنی چێشتخانەکە لە ئەسحابەسپی، بە هیچ کلۆجێک قەرەیان نەکەوتین. چونکە هەردووکیان بە بنەماڵە سەر بە حیزب بوون، یەکێکان خاڵی بنەماڵەیەک و ئەوی تریان خوشکەزای بنەماڵەیەکی سەر بە حیزب بوو. تێنەگەیشتم نائیب ویستی بەم کارە من تووشی گێچەڵ و سەرئێشە بکات یان چی؟!

## وەستای دۆوشکە

لە پەنجاکانی سەدەی پێشوو، لە گوندی تەپی سەفا، ئیشمان دەکرد، خەریکی دروستکردنی مزگەوت بووین لە دێیەکەدا بۆ حاجی مستەفا. من بە گەچ بنکەشیی خشتەکانم دەکرد، سەرقاڵی ئیش بووم، موشیری برای حاجی مستەفا هات تەماشایەکی ئیشەکە و دەست و پلمی کرد و وتی: خوا قەوەتت بدات وەستای دۆوشکە. تومەز ئەو سەردەمە لەو ناوچەیەدا گەچ کەرەستەیەکی بیناسازیی تازە و نەناسراو بوو، بە دۆی وشک یاخود وشکەدۆی تێگەیشتبوون.

## حیزبایەتی وەك سیل

لە ژیانی حیزبایەتیدا وا باوە هەموو ئەندامێکی حیزب نەک هەر دەبێت هەوڵ بدات بەڵکو ئەرکی سەر شانێتی کە دۆست و برادەرانی بهێنێتە ناو حیزبەوە، منیش لە هەڵەبجە لە گەڕەکی کانیی ئاشقان برادەرێکم هەبوو ناوی جەبار سەید قادر باخچەیی بوو، داوام لێ کرد بێتە ناو حیزبەوە، بەڵام ئەو، بێ سێ و دوو، وەڵامیدامەوە و وتی: کاک عەلی گیان، من خۆم تووشی سیل ناکەم.

## نەبوونی فەرمانبەری تایبەت

هەموو دە ساڵ جارێک و بەگوێرەی بڕیاری حکومەتی پادشایەتی ئەوکاتی عێراق، نفووسی دانیشتوانی وڵات تازە دەکرایەوە، ئێمەیش لە ساڵی ١٩٤٧دا کاتێک کە ماڵمان لە عەربەت بوو بەرانبەر بە مزگەوتەکەی عەربەت، سەرلەنوێ نفووسمان تازەکرایەوە، جا ئەو فەرمانبەرەی کە ناوی دانیشتووانی خەڵکی عەربەتی تۆمار دەکرد ناوی مەلا مارف بوو، موزەمیدی نەخۆشخانەکەی عەربەت بوو.

## چەتەکانی شێخ مەحموود

لە ساڵانی چلی سەدەی ڕابوردوو، ماڵمان لە عەربەت بوو، لە یادمە چەتەکانی شێخ بە سواریی دەگەڕان بۆ کۆکردنەوەی موڵکانە و پووشانە و ئاو و خەلە و خەرمان و دەغڵ و دان لە جووتیارانی ناوچەکە، بۆ ماڵی شێخیان کۆدەکردەوە، بۆ شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموود. گەر گومانیان لە هەر کەسێکیش بووایە ناحەزی ماڵی شێخە، حەسیرمەیدانێکی چاکیان دەکرد، بەتایبەتی مامۆستایانی قوتابخانەکان، کە لە دژی ئەم ڕووتاندنەوەیەی جووتیارەکان بوون و هانی جووتیارانیان دەدا بێزاریی دەرببڕن و بچن لای پۆلیس و بەڕێوەبەری ناحییە سکاڵا بکەن.

ئەوکات من لە پۆلی چوار بووم، مامۆستا شێخ جەعفەر بەرزنجی مامۆستای قوتابخانەکەمان بوو، لەپای پشتیوانیکردنی لە جووتیارەکان، چەتەکانی شێخ هەڵیانکوتایە سەری بۆ

قوتابخانەکە، بەڵام مامۆستا لە دەستیان هەڵات و بە هەڵەداوان خۆی کرد بە پۆلیسخانەکەدا، لەو کاتەیشدا ئەفسەرێکی مفەوەز بەڕێوەبەری بنکەکە بوو ناوی ڕەئوف بەگ بوو و هەمەوەندی بوو و زۆر ناحەزی شێخان بوو.

## ئەگەر حکومەت داوام لێ بکات

سەرەتای ساڵانی چل بوو، باس لەوە دەکرا کە حیزبێک لە سلێمانی پەیدابووە لایەنگریی لە جووتیاران دەکات دژ بە شێخ و دەرەبەگ و بەگزادە، دێتەوە یادم ڕۆژگارێک کە ماڵمان لە عەربەت بوو، ڕۆژێکیان لۆرییەکی پڕ لە قوتابی هات لە بەر دەم مزگەوتەکەی عەربەتدا ڕاوەستا و قوتابییەکی زۆر لە بەر مزگەوتەکەدا دابەزین کە لە سلێمانییەوە هاتبوون بۆ هاندانی جووتیارەکان لە دژی شێخ مەحموود و چەتەکانی. قوتابییەکان داوایان لە جووتیارانی عەربەت کرد کە لەپای بە زۆر سەندنی سەرانە لێیان لەلایەن شێخەوە، بچن ئێخەی حکومەت و دام و دەزگاکانی بگرن. من لە ناو قوتابییەکانی سلێمانی دوو قوتابیم لێ ناسینەوە، یەکێکیان ئەحمەد حامید و ئەوی تریان عەلی حسێن بوو کە خەڵکی وارماوا بوو.

وا دیار بوو کە چەتەکانی شێخ سکاڵایان لە سەر باوکم تۆمارکردبوو لەبەرئەوەی کە ئەوە کوڕەکەی ئەوە چووە ئەو قوتابییانەی لە سلێمانییەوە هێناوە بۆ عەربەت. هەر بۆیە لەپاش بەینێک و لەلایەن بەڕێوەبەری بنکەی پۆلیسەوە باوکم بە مەبەستی لێپرسینەوە لێی بانگی پۆلیسخانە کرا. لەپاش

لێپرسینەوە باوکم ڕووی قسەی لێناین و وتی: من پۆلیسی حکومەتم، ئەگەر حکومەت داوام لێ بکات فیشەک بە ئاسمانەوە بنێم، بێ چەند و چوون فیشەکی پێوە دەنێم.

## چارەسەرەکەی شێخ عەلادینی بیارە

سەرەتای سالانی چل، کە لە مالی حەمەی غەفوور لە عەربەت نیشتەجێبووین، دایکم چاوی مووی تێدابوو، زۆر جار داوای دەکرد بچێت بۆ بیارە بۆ لای شێخ عەلادین بۆ چارەسەر، چونکە ئەوکات پزیشک نەبوو بۆ چارەسەری چاو، مەگەر لە بەغدا پزیشک دەستبکەوتایە.

ئێمەیش خێزانەکەمان بێکەیبانوو دەماین، ئەگەر دایکم بچووایە بۆ بیارە، هەر بۆیە باوکم داوای لە خالە عەبدولکەریم لە قرگە کرد کە دولبەری کچی بۆ ماوەی هەفتەیەک بنێرێتە لای منالەکانی لە عەربەت. ئیتر خالە عەبدولکەریم دولبەری نارد بۆ لای مندالەکان.

لەپاش ئەوە دایکم چوو بۆ بیارە بۆ خزمەتی شێخ کە دایکم بڕوای زۆری پێ بوو و وای دەزانی هەر ئەوەندەی شێخ چاوی بە چاوی بکەوێت ئیتر یەکاویەک چاوی چاک دەبێتەوە، بەڵام شێخ عەلادین لەجیاتی هەموو چارەسەر و دەوا و دەرمانێک، تۆپەڵێک تفی کردە ناو چاوی دایکمەوە!

ئیتر لەپاش بەینێک دایکم بە نائومێدی و دڵشکاوی گەڕایەوە بۆ عەربەت و بە کەسەرەوە باسی مامەڵەکەی شێخ عەلادینی بۆ کردین. بەڵام دایکم لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا کە لە بیارە بوو، لە ناو خەڵکەکەدا بڕێک قسە و باس و خواسی بیستبوو.

دەیوت لە تەکیەکەی شێخ باسی ئەوە کراوە کە لەلایەک دەڵێن شێخ عەلادین بەو مووچەیە دەژی کە حکومەتی عێراق بۆی بڕیوەتەوە و لەلایەکی تر دەڵێن بە گەڕان بە بە دەوروبەری هەڵەبجە پارە و پێویستی لە خەڵک کۆدەکاتەوە و خۆی پێ دەژێنێت.

لەو کاتەدا حیزبی شیوعی بە ناوی حیزبی تەحەرور لە کوردستاندا چالاکی دەکرد، جا لە تەکیەکەی شێخ بە دایکم و ئەو خەڵکەیان وتبوو: حیزبێک پەیدابووە دژی خوا و ئایینی ئیسلام و هەموو شێخان و تەکێ و خانەقا و ئاغا و دەرەبەگ و بەگزادە و حکومەتی خاوەنشکۆیە، ئامۆژگاریی کەس و کارتان بکەن بە هیچ جۆرێک توخنی نەکەون و خۆیانی لێ دوورەپەرێز بگرن.

## بەزەییەکەی ئوفەی خانم

ساڵی١٩٦٣، سەرەڕای مەینەتی سیاسی و نەبوونی و گرانی، سەرما و ڕەشەبا و بەفر و باران بە دەیان ستوونی کارەبای گەڕەکەکانی وەکو کەوان دەچەماندەوە. سووتەمەنی بە جارێ چۆڕی بڕا. کەچی سەرباری هەموو ئەوانە، ناحەزان و دوژمنانی حیزبی شیوعی خەریکی دامەزراندنی کانیی ماسی بوون بە هاوکاریی هەواڵگریی و ئەمنی حکومەتی عەبدولسەلام عارف. لەلایەک بۆ پاراستنی خۆیان و ئەندامەکانیان و لەلایەکی تر بۆ لەناوبردنی ناحەزانی خۆیان دەستیاندابووە گرتن و ڕاوەدوونان و کوشتنی شیوعییەکان.

من ئەوکات تازە لە هێڵی گواستنەوەی ناوخۆ یاخود مەسڵەحەی نەقلی ڕیکاب دامەزرابووم، بە هەزار حاڵ

تەنەکەیەک نەوتم دەستکەوتووە بە دینارێک، لە بەنزینخانەی عەقارییەوە بە پاسی سابوونکەران هێناومەتەوە بەر خانەقا، لە بەر خانەقایشەوە لە گەڕەکی شیوی قازییەوە تاوێک بە دەست و تاوێک بە سەر شان، تەنەکە نەوت بەرەو ماڵ دەبەمەوە. بە دەست تەنەکە نەوتەوە تەواو شەکەت و ماندوو بووم، لە بەر دەم ماڵی قالە سووری دارتاشدا لە شیوی قازی، تەنەکە نەوتم دا نا تاکو پشوویەک بدەم، کاتێک سەرم هەڵبڕی چاوم لێیە لەلای خوارەوە زەلامێک کە دەستی منداڵێکی لە ناو دەستدایە، کتوپڕ دەستی لە دەستی منداڵەکە کردەوە و دەستی کرد بە بەر پشتوێنەکەیدا و بە خێرایی بەرەو ڕووم هات! بەڵام کە جوان لێم وردبووەوە ماندوو دیارم و بە دیار تەنەکەیەک نەوتەوە دانیشتووم، هەنگاوەکانی خاو کردەوە و لە نیازەکەی پاشگەز بووەوە و گەڕایەوە و چووەوە بە لای منداڵەکەوە. بەڵام من چونکە پێشتر ئەو زەلامەم بینیبوو و دەمناسی، زانیم کە ئەوە ئوفەی خانمە. ناوبراو یەکێک بوو لە پیاوکوژەکانی ئەو ڕۆژگارە و ئەوکات سەر بە پارتی بوو. دیاربوو نیازێک هەبوو بۆ تیرۆرکردنم، بەڵام ئوفەی خانم خۆی و ویژدانی خۆی، کاتێک کە بەو حاڵە بینیمی بە دەست تەنەکەیەک نەوتەوە گیرم خواردووە، بەزەیی پێمدا هاتەوە دەستی تێ نەچوو بمکوژێت. هەرچۆنێک بوو تەنەکە نەوتم گەیاندەوە ماڵەوە. بۆ ڕۆژی دواتر ڕووداوەکەم بۆ ئەورەحمانی برام گێڕایەوە کە ئەویش ئەوکات لەگەڵ پارتی بوو.

لەو ڕۆژگارە سەخت و تووشەدا هەرچی پێویستییەکانی ژیان بوو بە کاروانی سەربازیی لە بەغدا و کەرکوکەوە دەهات.

کاتێک کە تەقە و ڕەقەیەکیش دەبوو ئەوەیشمان بۆ نەدەهات. لە ناو بازاڕی شار دووکانی وا هەبوو ڕەنگە پێشتر کەلوپەل و کاڵای سی تا چل ساڵ لەوەوبەری تێدا بووبێت، بەڵام کاتێک کە دۆخە سیاسییەکە تێکچوو هیچ دووکانێک کیلۆیەک شتی تێدا نەما. تەنانەت لە قوڕگی هیچ ئاشێکی ئارد و چەڵتوکی شاردا کیلۆیەک ئارد یاخود برنج نەما. ئەوەی لەو سەردەمەدا بە سەر خەڵکدا هات نە دەگێڕدرێتەوە و نە لە باسکردن دێت. کەچی لەولایشەوە پارتی یان مەلاییەکان دەستیان داگرتووە لە جەلالییەکان و لە سێ قۆڵەوە خەریکی شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەیانن، لە قەرەداغ و بازیان و شارباژێڕ. تاکە ڕێگا کە بۆ جەلالییەکانیان هێشتبووەوە ئێران بوو. ئێمە ئەوکات وەکو حیزبی شیوعی بە حیزبمان وت: بوونی جەلالییەکان لە ئێران بە قازانجی وڵاتەکەمان ناگەڕێتەوە، بۆچی ئێوە وەک حیزب قسەیەکی خێر ناکەن، یاخود ئێوە لەوبارەیەوە ڕاتان چییە؟ حیزب لە وەڵامدا وتی: هەرچەندە حکومەتی دیکتاتۆریی عەبدولسەلام عارف فەرمانڕەوای وڵاتە، بەڵام ئێمە پێمان باشە ڕێگە بدرێت جەلالییەکان بێنەوە وڵات و دابنیشن.

## سەلامی مەلا سابیر چی بە عەلی بۆسکانی وت؟

سەرەتای ساڵانی هەشتا بوو، دوای نیوەڕۆ بوو و لەگەڵ جەلال ئەبوشوارب لە دووکانەکەی عەلی بۆسکانی لە بازاڕی عەسری دانیشتبووین، کاتێکمان زانی سەلامی مەلا سابیر هات بۆ لای عەلی بۆسکانی. سەلام، ئەوەندەی من چەند جارێک لە نزیکەوە بینیبووم و دەمناسی، لەو جۆرە پیاوانە بوو کە حەزی

له شەڕەجوێن و شەڕەقسە بوو. هەر لەگەڵ خۆی کرد بە دووکانەکەدا ڕووی دەمی کردە عەلی و بە سەر پێوە پێی وت: سەگی سەگباب، ڕەئوف کانیساردی خەریکی شیوعی کوشتنە، کەچی هاموشۆت دەکات بۆ دووکانەکەت و تۆیش دەستت پێیەوەیەتی و یارمەتی دەدەیت! ، بەڵام عەلی بۆسکانی بەرانبەر بەم قسەیە کە سەلام پێی وت وەڵامی پێ نەبوو و ورتەی لە دەم نەهاتە دەر.

## پرسیارێك كە بێوەڵام مایەوە

لەدوای ڕاپەڕینەوە تا ئەو ڕۆژەی مانگی ئەیلولی ساڵی١٩٩٣ کە تیرۆرکرا، هەر جارێک عەزیز محەمەدی سکرتێری حیزبی شیوعی، بە سەردان بهاتایە بۆ سلێمانی، شەو لە مقەڕ نەدەمایەوە، بەڵکو دەچوو لە ماڵی عەلی بۆسکانی ڕۆژی دەکردەوە. بڕواننە ڕادەی دڵنیایی حیزب و سکرتێرەکەی لە عەلی بۆسکانی! منیش، لەپاش تیرۆرکردنەکەی، بە سەرانی حیزبم وت: ئەگەر عەلی بۆسکانی پیاوێکی خراپ بوو، عەزیز محەمەد بۆچی دەچوو شەو لە ماڵیان دەمایەوە؟ ئەگەر پیاوێکی باشیش بوو، بۆچی حیزب ڕێگریی نەکرد لە تیرۆرکردنی؟! بەڵام کەس نەبوو وەڵامێکی ئەم پرسیارەم بداتەوە.

## ئەو نامەیەی كە بە شێخ نەجمەدین دا ڕەوانەم كرد

گەرمەی دانوستانی نێوان یەکێتی و حکومەتی بەعس بوو، ئێوارەیەکیان چووم بۆ بازاڕ بۆ دووکانی بەڕێز (و.ئـە)، بەر لەوەی کە بچمە ژوورەوە بۆ دووکانەکەی و سڵاوی لێ بکەم،

تەماشام کرد هەر خۆی بە تەنها دانیشتووە، کاتێک کە منی بینی، بەرەو دەرگاکە هات بەرەوپیرم، من لە سەرەتادا وامدەزانی کە دەرگاکەی لەودیوەوە داخستووە و بۆ ئەوە بەرەوڕووم دێت تاکو لێمی بکاتەوە، بەڵام بە تووڕەییەکەوە بە خێری هێنام و وتی: وەرە دانیشە، نازانم ئێوە لە گوێی گادا نووستوون یان چی؟!، وتم: چی بووە فڵان کەس؟ وتی: جوان گوێم لێ بگرە، هەرچییەکت پێ دەڵێم لە سەر پارچە کاغەزێک بینووسە، دە دانە ڕۆژی تەواوە شێخ جەعفەر بەرزنجی پارێزگاری سلێمانی لەگەڵ یەکێتی و بەتایبەت شێخ جەعفەر شێخ مستەفا قەرەداغی خەریکی ئەوەن داوێکی گەورەیان بۆ ناونەتەوە لە پشتئاشان و پەیتا پەیتا تەوقتان دەدەن و گەلەکۆمەتان لێ دەکەن، ئەگەر فریای خۆتان نەکەون تیادەچن، هەڵسە بڕۆ خێرا هەواڵ بدە بە هاوڕێیان تا کار لە کار نەترازاوە.

منیش دەسبەجێ لای ئەوم جێهێشت و چووم بۆماڵی شێخ نەجمەدین، برای بەهادین نوری، کە ماڵیان لە گەڕەکی خەبات بوو. لەگەڵ شێخ نەجمەدین دانیشتین بەیەکەوە و ئەو زانیارییانەی کە من (و.ئە)ی برادەرم دابووی پێم و لە دووکانەکەی نووسیبوومەوە، شێخ نەجمەدین سەرلەنوێ هەمووی بە دەستخەتی خۆی نووسییەوە و وتی: بۆ ئەوە بە دەستخەتی خۆم دەینووسمەوە چونکە بەهادین دەستخەتی من دەناسێتەوە.

ئەوکات بەهادین نوری بەرپرس بوو لە پێشمەرگەکانی ئەو ناوچەیە کە هەرێمی کەرکووک-سلێمانییان پێ دەوت و باس لەوە دەکرا کە لە ناوچەی شارباژێڕ و ئەحمەدئاوا و قەرەداغ خاوەنی نزیکەی حەوتسەد پێشمەرگە بوو.

هەروەها شێخ نەجمەدین وتی: کە بە دڵنیاییەوە پێت دەڵێم سبەینێ ئەم کاتە نامەکە لەلای کاکم دەبێت. منیش وتم کاکە شێخ گیان، من بۆیە هاتم بۆ لای تۆ چونکە کارەکە زۆر بەپەلەیە و پێویستە نامەکەم زوو بگات بە دەستی حیزب، ئەگەرنا من خۆم دەچم بۆ ئەحمەدئاوا و بە دەستی خۆم دەیبەم بۆیان. بەڵام شێخ نەجمەدین دڵنیایی تەواوی دا پێم و وتی تۆ بێخەم بە.

بەدوای ئەوەدا هەمووی هەر دوو هەفتەیەکی پێ چوو، هەواڵ بڵاوبووەوە کە یەکێتی بە کۆمەک و پشتیوانیی بەعس پەلاماری بارەگای سەرکردایەتی حیزبی داوە لە پشتئاشان و قڕناقا و بە دەیان کوژراو هەن، تەنانەت ئەوانەیشیان کوشتووە کە شەڕیان نەکردووە و خۆیان داوە بەدەستەوە.

هەڵبەتە من لە سەرڕاستیی و ڕاستگۆیی شێخ نەجمەدین هیچ گومانم نەبوو، چونکە لە مێژبوو پێکەوە کاری سیاسیی و حیزبایەتیمان دەکرد، تەنها بۆ جارێکیش نەک هەر دەسخەڕۆی نەکردم بەڵکو درۆیشی لەگەڵ نەکردم. دیارە کە بەهادین نوری نامەکەی گەیشتووەتە دەست و خوێندوشێتییەوە، بەڵام بە هەر هۆیەک بێت، حیزبی لە ناوەڕۆکی نامەکە ئاگادار نەکردووەتەوە. خۆ دەشێت بەهادین نوری حەزی بە چارەی سەرانی ئەوکاتی حیزب نەکردبێت و خواخوای ڕۆژێکی وای بووبێت کە هەموویان لەو ڕووداوەدا تەفر و تونابن.

## ڕۆژانێکی ڕەش

لە ساڵی١٩٦٤دا، ڕۆژێکیان دەستەی شیوعیکوژانی کانیی ماسی دابەزینە ناو بازاڕی شار و ئەو شیوعییانەی کە پێشتر دەستنیشانیان کردبوون دەستیان کرد بە تیرۆرکردنیان.

یەکەم کەس کە تیرۆریان کرد نوری فافۆن بوو کە کانێسکانی بوو و کتومت لە یادم نەماوە دووکانەکەی لە کوێی بازاڕدا بوو. بە دوای ئەودا ئیسماعیل پاڵەوان، کە لە خوار مزگەوتی هەلاجەکانەوە پەلاماردرا و تەقەی لێ کرا، بەڵام تەنها زامداربوو و نەمرد. سێیەم کەس عومەری مام عەلیی دووکاندار بوو، کە ماڵەکەیان بە بەری ئەوبەری ماڵی حەمەی ئەوڕەحمان ئاغاوە بوو. عومەر لە سەر یاڵەکەی گەڕەکی خەبات تیرۆرکرا.

بۆ ڕۆژی دواتر عوسمان سەیوانی لە قەزازەکان تیرۆر کرا، بە دوای ئەویشدا حەسەن پاڵەوان کۆپاندروو کە خەڵکی گەڕەکی مەڵکەندی بوو. لەدواییدا مچەی باوە گەورە و کامیلی شەفیق، کە دوان لە شیوعیکوژانی کانیی ماسی بوون، لای حەمامەکەی سەید عەلی لە سەرشەقام تەقەیان لە کەریمی عەبە خڕەی تەنەکەچی کرد، بۆ خۆشبەختی گوللەکان بەر لاقی کەریم کەوتن و کەریم نەمرد بەڵام ئەو لاقەی بە جۆرێک سەقەت بوو تا مرد هەر ئەشەلی.

هەروەها چەند قوتابییەکی سەر بە پارتی لای دواناوەندیی سلێمانی کوڕان پەلاماری حەسەن فەرەج دڕەیی ئەندامی حیزبی شیوعییان دا و بە چەقۆ کوشتیان. هاوکات ناحەزانی حیزب لە گوندی جافەران لە قەرەداغ (سەعی لالە)یان تیرۆر کرد، لە لایەکی ترەوە کانیی ساردییەکان لای سەرووی دەرگای سەرا لە شەقامی پیرەمێرد (ڕەئوفی حاجی قادر)یان تیرۆر کرد. هاودەم لە سەرشەقام لای ماڵی غەفوری میرزا کەریم، ڕەئوف کانیی ساردی و عومەری سالەی مەسور بە خەنجەر و چەقۆ پەلاماری عەلی سەعید موزەمیدی ناسراو بە (عەلی مەجە)یان

دا. عەبدوڵڵا تۆفیقی موزەمیدیش کە قەرەداغی بوو، لەو ماوەیەدا لە ماوات تیرۆرکرا. وێڕای تیرۆرکردنی حەمەسدیق حەمەئەمین کە هەڵەبجەیی بوو وماڵیان لە گەڕەکی خەبات بوو لای ماڵی مەلا ڕەسوڵ، ناوبراو پاسەوانی مۆزەخانە بوو. سەرباری تیرۆرکردنی جەلال سەعیدی ناسراو بە جەلالی ڕابیعە، لەلایەن تاقمەکەی عەزیز حاجەوە. هەر لەو دەوروبەرەدا کوڕێک کە پێشمەرگەی حیزب بوو بە کەمالی حاجی بانگیان دەکرد، کانیی ساردییەکان لە ژێر چوخمەکەی سابوونکەراندا تیرۆریان کرد.

هەر لەو ماوەیەدا حکومەت لە کۆڵانی قەزازەکان لە نزیک ئەسحابەسپی و بۆ زیاتر قووڵکردنەوەی ناکۆکیی نێوان شیوعی و پارتی، مچەی باوە گەورە و کامیلی شەفیقی کوشت کە دوو کەسی دیار و بەرچاوی تاقمە شیوعیکوژەکەی کانیی ماسی بوون.

## بەرپرسە کوونییەکە

بەر لە شاڵاوەکانی ئەنفال و داگرتنی گوندەکان، چەندین جار بە کیسەی پڕ و هەگبەی پڕ لە پارە و خواردن و کەلوپەل و جلوبەرگ و پێڵاو بۆ پێشمەرگەوە، چووم بۆ شاخ و دێهاتەکان بۆ سەردانی پێشمەرگەکانی حیزب. دەوروبەری ناوەڕاستی ساڵانی هەشتا بوو جارێکیان چووم بۆ شیوی قازی، کە لەوێ مام بارام (حەمەی نانەوا) بەرپرس بوو. لەو سەردانەمدا مەلا حەسەن-م بینی، دوای دانیشتن و ماوەیەک وچان و حەسانەوە و نانخواردن، دەستی کرد بە هەواڵپرسین و هەر بە سەر پێوە باسی برێک بابەت و خواس و بەسەرهاتی شارم بۆ گێڕایەوە،

پرسیاری کرد ئاخۆ کەس دەتوانێت لە ناو شاردا ئیش و کاری حیزبیی بکات و دەرنەکەوێت، واتە شاراوەیش بێت؟ منیش وتم بەڵێ کەسێک کە ئاقڵ و وریا و ئاگاداری خۆی بێت دەتوانێت ئەوە بکات. پاشان وتی: ئێستا کێ بەرپرسی حیزبە لە سلێمانی؟ وتم: کەمال زەهاوی. وتی: جا خۆ کەمال کوونییە (حیزە)! وتم: جا خۆ من نەمکردووە بە بەرپرس، ئێوە خۆتان داتانناوە.

## تێکبەربوونی هاوڕێکان

لە کۆتایی ساڵانی شەست و لە کۆبوونەوەیەکدا لە ماڵی حسێن عارفی پارێزەر و نووسەر، کە خانووەکەیان لە ڕیزی ماڵی حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا بوو لەوبەری ئۆرزدیباکەوە و ئەم کەسانە لە کۆبوونەوەکەدا ئامادە بوون: حسێن عارف، شێخ عەلی کاژاویی نائیب زابت برای شێخ باقر، حەمەئەمین پێنجوێنی، فاروق مەلا مستەفا، مامۆستا ئەحمەد میرزا، مەلا عەزیز نەقاڕ، فایەق دەرەویانی، سەعەسوور جافەرانی، عەلی حامید، هەر لە سەرەتاوە کۆبوونەوەیەکی ئاسایی دەرنەدەکەوت، کتوپڕ لە نێوان شێخ عەلی و حەمەئەمین پێنجوێنی دا دەمەقاڵێ و قرەقرێک دروست بوو نەمزانی هۆکارەکەی چی بوو، کاتێکمان زانی شێخ عەلی و حەمەئەمین پێنجوێنی تێکبەربوون، شێخ عەلی حەمەئەمین پێنجوێنی دایە بەر مشتەکۆڵە و شەق و تەختی ئەرزی کرد، حەمەئەمین پێنجوێنییش کە کەوتبووە ژێرەوە، لە ژێرەوە هەر لەقەی دەکێشا بە شێخ عەلی دا، برادەران هەر بەخێرایی کەوتینە لێککردنەوە و ناوبژیکردنیان، جا بەوەی باش بوو کەسیان زامدار نەبوون. ئیتر من لە داخاندا سەری خۆم

هەڵگرت و ژوورەکەم جێهێشت و چوومە دەرەوە بۆ هەیوانەکە، لەوێ لە هەیوانەکە گوێم لێ بوو خێزانەکەی حسێن عارف دەیبۆڵاند و دەیوت: بەزیای خێرم نەکرد، دەڵێی تەویلەیە، ئەوە بۆچی وا بەربوونەتە گیانی یەکتری!؟.

ئێستایش نەمزانی ئەو کۆبوونەوەیەمان بۆ چی کرد؟! بەڵام من ئەو وازهێنانەی کە لەدوای ئەم کۆبوونەوەیە وازم لێ هێنان، جارێکی تر نەچوومەوە بۆ لایان. بەڵام لەپاش ماوەیەکی زۆر ناردیان بە شوێنمدا کە بچم بە دوای عومەر بەلیس کە برینپێچ یاخود یاریدەدەری پزیشکیی کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار بوو، تاکو بچین بۆ کۆبوونەوە لەگەڵیان لە ماڵی شێخ حامید، لە ڕۆژئاوای دارولتەڵەبەی سەروو سابوونکەران. کۆبوونەوەکە لەوێ بوو. لەگەڵ عومەر بەلیس پێکەوە ڕۆیشتین و لە ڕێگا پەیمانمان بە یەکتری دا قسەمان بکەین بە یەک و ئەم حیزبۆکەیە بە حیزب نەزانین و جێیانبهێڵین. چووین بۆ کۆبوونەوەکە. لەوێ ئەم کەسانە ئامادەبوون: شێخ عەلی نائیب زابت برای مامۆستا باقر، شێخ حامید کە لە کارگەی جگەرە بوو، فاروقی مەلا مستەفا، مەلا عەزیزی نەقارِ، من و عومەر بەلیس. شێخ عەلی بە عومەری بەلیسی وت: بۆچی ئامادە نابن و نایەن بۆ کۆبوونەوە؟ عومەر وتی: تاقەتی حیزبایەتیم نەماوە و ئەمە حیزب نییە. ئینجا شێخ عەلی پرسیاری لە من کرد: ئەی تۆ بۆچی ئامادە نابیت؟ منیش وتم: بەداخەوە لەدوای کۆبوونەوەکەی ماڵی حسێن عارف حیزبایەتیم لەبەرچاوکەوتووە، ئەو ماوەیەیش کە شیوعی بووم بە ملیۆنان دیناری ناگۆڕمەوە و شانازیی پێوە دەکەم، ئەمەیش حیزب نییە تا ئیشی تێدا بکەم. شێخ عەلی دەسبەجێ و بە

توڕەییەوە وتی: ئەی یەمینی گەواد حیزبە؟! من هیچ وەڵامیم نەدایەوە و وتم: ماڵمان لە گەڕەکی خەباتە، وەکو دۆستێک ئەگەر شتێک بە من کرا ئامادەم. لەپاش ئەوە لەگەڵ عومەر بەلیس هاتینە دەرەوە و ڕۆیشتین.

## جووەکانی سلێمانی

لە شاری سلێمانی گەڕەکێک هەبوو لە خوارووی ڕۆژئاوای شارەوە پێیان دەوت گەڕەکی جوولەکان. ئەم گەڕەکە لە هەر چوار لاوە لە شاری سلێمانی دابڕابوو. ڕەنگە بتوانین بڵێین لە سەد ماڵێک پێکدەهات و پەرستگایەکی گەورەیان لە ناو گەڕەکەکەدا هەبوو لەدواییدا وەک زۆرێک لە پەرستگاکانی ئایینەکانی تری بەر لە ئیسلام کرا بە مزگەوت.

بۆنەیەکی جووەکان کە زۆر سەرنجی ڕادەکێشا ئەو بۆنەیە بوو کە هەموو ساڵێک لە١ی مانگی ئەیلولدا و لەوبەر گەڕەکەوە کە دەشتاییەک هەبوو، سازیان دەکرد و بە جەژنی کەپرە شینە ناسراو بوو. هەموو ماڵەکان لەو شوێنەدا کەپرێکیان ساز دەکرد بۆ شەوێک کە بۆ سبەینێکەی شەممەیە. ڕێکەوت وا بوو سروشت بارانێکی بۆ دەباراندن.

دەوترا یەکێک لە جووە زەنگینەکانی شار بوو بوو بە هاوبەشی بازرگانیی و ئیشی حەمەی فەرەج ئەفەندی کە موسڵمانێکی دەوڵەمەندی شار بوو و گەراجی ئۆتۆمبێلی هەبوو لە ڕیزی مزگەوتی ئەوقاف و چەند لۆرییەکی هەبوو بە هاوبەشی لەگەڵ ئەو کابرا جووە، لۆرییەکان دەستەیەکیان هاموشۆی پێنجوێنیان دەکرد و دەستەیەکیان هاموشۆی ڕانیە

و قەڵادزێیان دەکرد. بەڵام زستانان لە بەر داخرانی ڕێگاوبان هاتوچۆ نەبوو.

باس لەوە دەکرا کە حەمەی فەرەج ئەفەندی، بۆ ئەوەی هەموو سامان و موڵکەکە بە تەنها بۆ خۆی بێت و بمێنێتەوە، جووەی هاوبەشی کار و بازرگانییەکانی خۆی کوشتووە و بە مەبەستی شوێنبزرکردنیشی لاشەکەی خستووەتە ناو بیری حەوشەکەی ماڵی خۆیانەوە.

جوویەک کە لەو ڕۆژگارەدا بووبوو بە موسڵمان و ناویان نابوو ساڵحە فەنی، کچێکی هەبوو لەدواییدا بوو بە خێزانی کوڕەکەی نامیق ئاغا، کە ماڵیان لە گەڕەکی سەرشەقام بوو.

یەکێکی تر لە جووەکان لە مەیدانی ماستفرۆشان لە دووکانی حاجی سەلیم لەگەڵ کوڕێکی پورزام دووکانی جۆلایی هەبوو پێش ئەوەی بچێت بۆ ئیسرائیل. لە دووکانەکەی پۆپەشمین و جاجم و بەڕە و ئەو جۆرە کالایانەی بەرهەم دەهێنا.

جوویەکی تر هەبوو درێغ ناوەکەیم لە یاد نەماوە، لە ناو بازاڕدا شەکری کەللەی دەفرۆشت. ڕۆژانە لە ناو بازاڕ و شوێنە گشتییەکاندا، دوو تا سێ گوێنی شەکری کەللەی ساغ دەکردەوە و دەیکرد بە پارە. ئەوکات دووکاندارەکانی سلێمانی کەللەیەک شەکریان دەدا بە ٣٦ فلس، بەڵام ئەم جووە کەللەیەکی دەدا بە ٣٢ فلس. جووەکان بەوە ناسراوبوون کە زۆر هەرزانفرۆشن. کار و کاسبییەکەیشیان زیاتر زەڕەنگەریی و ئاڵوگۆڕی دراو بوو.

هەندێک جار لێرە و لەوێ دەبیستین دەڵێن جووەکان بۆچی سەری خۆیان هەڵگرت و ئەم شارەیان جێهێشت؟ لەڕاستییدا ئەگەر من جوو بوومایە نەک لە ساڵانی چل و پەنجا بەڵکو لە

سییەکان و زووتریش کۆچم دەکرد. مەگەر لەلایەن هاوشارییە بە ئایین جیاوازەکانیانەوە کەم سووکایەتی بە خۆیان و ئایینەکەیان کرا؟ کەمیان تێهەڵدرا و پێیان وترا (لە دینت بەم!) (بە ڕیشی مەردانەت قەسەم!) واتە: ئێوەی جوو ئەو ڕیشەی کە هەتانە ڕیشی پیاوێکی مەرد نییە!

## جووەکانی هەڵەبجە

لە ساڵانی چل، کە ماڵمان لە هەڵەبجە بوو، بەتایبەتی کۆتایی ئەو ساڵانە، لە هەڵەبجە بانگەواز دەکرا بۆ خەڵکی موسڵمان تاکو ببن بە خۆبەخش و بچن لە فەلەستین بەشداریی شەڕی دژی جوودا بکەن. یەکێک لەو کەسانە کە مفەوەزی پۆلیس بوو و ناوی حەمدی ئەفەندی بوو، باوکی مامۆستا ئازاد حەمدی، بوو بە خۆبەخش و چوو بۆ شەڕی فەلەستین و ئیتر نەگەڕایەوە.

گەڕەکی جووەکان لە هەڵەبجە کەوتبووە ناوەندی شارەوە و نزیکەی سی تا چل ماڵێک دەبوون. لە خەڵکی بێجگە لە خۆیان زۆر گۆشەگیر و دابڕاوبوون، نازانم چۆن دەژیان.

لە ناو بازاڕ کەسێک دیار نەبوو بڵێن ئەم جووە دووکانی هەیە لە فلانە شوێن، خانوویەکی بچووکیان هەبوو لە ڕیزی ماڵی سۆفی عەبدوڵڵای باوکی ع.ع. شەونم، ئەم خانووە بچووکە پەرستگای جووەکان بوو و لەدواییدا کرا بە مزگەوت و مەلا عومەری برای مەلا عەلی بزووتنەوەی ئیسلامییان کردە مەلای. هەروەها دەوترا گوایە کاتی خۆی سۆفی عەبدوڵڵا جوو بووە و بووەتە موسڵمان.

پیاوێکی باڵابەرزی لەش و لار لاواز لە سەر ڕووی شەقامی ڕۆژئاوای گەڕەکی جوولەکان بەرانبەر بە لۆقنتەکەی ئیمام کە

لە ژووررووی چایخانەکەی عومەر ملۆزم بوو، ئەم پیاوە لە دووکانەکەیدا بە دزییەوە مەی و خواردنەوەی دەفرۆشت و ناوی شەمە بوو. شەمە کچێکی جوانکیلەی هەبوو ناوی شەوە بوو، بە هۆی دڵداریی لاوانی ئەو سەردەمەوە ناوی ڕۆیشتبوو و ناسراو بوو.

لە دوای لێبوونەوەی دووەمین جەنگی جیهان دەنگۆی ئەوە بڵاوبوویەوە کە لە فەلەستین دەوڵەتێک بۆ جووەکان دادەمەزرێنرێت. ئەم هەواڵە جموجوڵی خستبووە ناو جووەکانەوە و بۆ کۆچ کردن خۆیان کۆدەکردەوە. ئەوکات حکومەتی ئێران شاهەنشایی بوو، لە دژی دامەزراندنی دەوڵەت بۆ جوو لە فەلەستین نەبوو. ژمارەیەکی زۆر لە جووەکان هەوڵیاندا لە ڕێگای ئێرانەوە ئەو کۆچە بۆ فەلەستین بکەن، بەڵام وا بڵاو بووەوە ئەو قاچاخچییانەی کە بڕیاربوو جووەکان لە ئێرانەوە ببەن بۆ فەلەستین، دەچوون لە ڕێگا جووەکانیان دەکوشت و لاشەکانیان لەو دەشت و دەرە دەشاردەوە.

بە یادەوەریی من جووەکان زیاتر لەلایەن کەسانی خوێندەوار و ڕۆشنبیر و بەتایبەتی لەلایەن شیوعییەکانەوە ڕێز و حورمەتیان لێ دەگیرا و وەک مرۆڤ تەماشا دەکران. لە هەموو ئەو خۆپیشاندانانەی کە حیزبی شیوعی لە کوردستان و لە عێراق دەیکردن، جووەکان بەشداریی چالاکانەیان هەبوو. بە گوێی خۆم گوێم لێ بووە هەندێک لە جووەکان دەیانوت: یاخوا ئەو پەنجانە بە بڕین بچن، کە پەیمانی پۆرتسموسیان بۆ بەریتانیا واژۆ کرد.

## کۆنفرانسەکەی محەلیی سلێمانی ساڵی ١٩٦٦

گەر بەهەڵەدا نەچووبم دەوروبەری پاییزی ساڵی ١٩٦٦ بوو، من لە هێڵی گواستنەوەی ناوخۆ (مەسڵەحە) فەرمانبەربووم، لە ڕێی حیزبەوە ئاگادارکرام دوو ڕۆژ مۆڵەت لە فەرمانگەکەم وەربگرم بۆ هەندێک ئیش و کاری تایبەتی حیزبی، منیش مۆڵەتم وەرگرت، دواتر ئاگادارکرام کە سبەینێ دواینیوەڕۆ بچم بۆ ماڵی عوسمان دانش کە ئەرزەوحاڵنووس بوو و ماڵەکەیان لە سەروو سەرا بوو لای مزگەوتی بن تەبەق.

عوسمان دانش کەسایەتییەکی ناسراوی سلێمانی و شیوعییەکی دیار بوو. هەڵبەتە منیش، بێ ئەوەی بزانم ئیش و کارەکە چییە، لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا چووم بۆ ماڵی عوسمان دانش. کاتێک کە چوومە ژوورەوە، ژوورێکی گەورە و فراوان لە ماڵەکەدا بوو، کۆمەڵێک خەڵک لە ژوورەوە دانیشتبوون و ناوبەناویش تاکە تاکە خەڵکی دیکە دەهاتن تا ژمارەی ئامادەبووان گەیشتە چل و دوو کەس. لەپاش یەکتری ناسین و ئەحواڵ پرسین، ئاگادارکراین کە ئامادەبووان لێرە لەم شوێنەدا بە مەبەستی گرێدانی یەکەمین کۆنفرانسی محەلیی سلێمانیی حیزب هاتوون و کۆبوونەتەوە. بەرپرسی ئەوکاتی محەلیی سلێمانییش ئامادەبوو کە نائیب عەبدوڵڵا بوو. ئەو کەسانەی کە من لە کۆبوونەوەکەدا ناسیمن، ئەمانە بوون: عوسمان کەریم چاوشین، شێخ عەلی نائیب زابت برای مامۆستا شێخ باقر کاژاوی، عەبدوڵڵای مەلا فەرەج کە لە ساڵانی پەنجا پێکەوە هەم سەرباز و هەمیش شیوعی بووین، سەید کەریم عازەبانی، سەید ئەحمەد عازەبانی، سەعید ئەحمەد ناسراو

بە سەعە سوور جافەرانی، فایەق دەرەویانی. مونیرە خان خوشکی مەلا عەلی (عەبەی مەلا فەرەج) نان و خواردنی بۆ ئامادە دەکردین. جا ئەوەی کە زۆر سەرنجی منی ڕاکێشا و نیشانەیەکی زۆری سەرسووڕمان و پرسیاری لام دروست کرد، ئەوەبوو کە شەوی یەکەمی کۆنفرانس لەلایەن کەسێکەوە لە دەرگای ماڵەکە درا، واتە کەسێک هات بۆ ئەوێ، دواتر زانیم ئەو کەسەی کە لە دەرگاکەی دا و هات بۆ ئەوێ، حسەی فارس بوو، هاتبوو چاوی بە مەلا عەلی (عەبەی مەلا فەرەج) بکەوێت، چاویشی پێی کەوت و قسەی لەگەڵدا کرد.

هەڵبەتە بابەتی ئەوەی کە حسە باسی چی لەگەڵ مەلا عەلی کرد، ئەوە بابەتێکە تا ئێستایش هەر بە نهێنی ماوەتەوە و من لێی بێئاگام و نازانم بۆ چی و دەربارەی چی بوو، بەڵام بابەتی ئەوەی کە چۆن حسەی فارس زانیبووی ئێمە لە ماڵی عوسمان دانشین و لەوێ کۆنفرانسی محەلیی سلێمانی دەکرێت، ئەوە جێی گومان و ترسێکی زۆرە، چونکە لای کەس شاراوە نەبوو کە حسەی فارس یەکێک بوو لە شیوعیکوژەکانی کانیی ماسی لەو کاتە لە ساڵانی شەستدا!

باشە، کە سەرکردایەتی حیزب تا ئەو ڕادەیە پەیوەندیی لەگەڵ هەندێک لە شیوعیکوژەکانی کانیی ماسی هەبوو، بۆچی ڕێگرییان نەکرد لە تیرۆری ئەوڕەحمانی ساڵحی خلە و مەلا عەلی موزەمید و دەیان کادر و ئەندامی چالاک و پێشکەوتووی دیکەی حیزب؟! ئایا ناشێت کە سەرکردایەتیی حیزب لەگەڵ شیوعیکوژەکانی کانیی ماسی دەستی تێکەڵ بووبێت و تێوەگلابێت؟!

بۆ زانیاریتان، حسەی فارس لەگەڵ عوسەی ئامە وەکو برا وابوون، زۆر کات کە بە سواری ماتۆڕ بە ناو شاردا دەسووڕانەوە، عوسە ماتۆڕەکەی دەئاژوت و حسەیش لەدوایەوە سەر دەکەوت.

## دوو براکە

عومەر و فاروق دوو برا بوون، کوڕی حەمە عەلی ناوێک بوون کە بە ئیش و فرمان عەریفی پۆلیس بوو و بە بنەچە خەڵکی گوندی عازەبانی ناحییەی وارماوا بوو. ئەوان لە سەرەتای گەنجێتییانەوە پەیوەندییان بە حیزبەوە کردبوو، عومەر کە بە ئازاد ناسراوبوو، لە شەڕی سۆیلەمیش چاوێکی لەدەستدابوو. فاروق لە ناو شار و بە نهێنی کار و چالاکیی حیزبیی ئەنجام دەدا. بەڵام دیاربوو ماوەیەکی زۆر بوو هەردوو برا، ژێر بە ژێر، بوو بوون بە ئەڵقەلەگوێ و پیاوی دەزگای ئەمن و خۆیان فرۆشتبوو و کاریان بۆ ڕژێم دەکرد.

من، لە شەوی ٣٠ لە سەر ٣١ی مانگی پێنجی ساڵی١٩٨٩، کاتێک کە ئەمن هەڵیکوتایە سەرماڵەکەم لە گەڕەکی ڕزگاری و لەدوای لێبوونەوە لە پشکنین و سۆراخ و گەڕان بۆ بەڵگە و نهێنی، بە چاوی بەستراو و دەستی کەلەپچەکراوەوە لەگەڵ خۆیان بردیانم بۆ ئەمن، لەلایەن فاروقەوە بە گرتن درام. ئێوارەی شەوی دەستگیرکردنەکەم، فاروق هاتە ماڵمان و دانیشت و یەکتریمان بینی و قسەمان کرد و بڕێک پارەم وەکو پیتاک دا پێی. فاروق کاتێک کە بە گرتی دام، بە مەبەستی زیاتر تێوەگلاندنم و بۆ تێچاندنم و بۆ دروستیی هەواڵێدانەکەی لە

من، له ئەمن وتبووی ئێواره چووم بۆ ماڵی عەلی و عەلی بڕی ئەوەنده دینار پارەی وەک پیتاک بۆ حیزبی شیوعی پێداوم.

ئەوەی که جێی سەرسوڕمانه ئەوەیه که من ئێوارەی شەوی دەستگیرکردنەکەم نامیلکەیەکی هەڵسەنگاندنی کۆنگرەی چواری حیزبی شیوعیم له ماڵی مەحمودی دەلاک وەرگرتبوو، ئەمنەکان که هاتنه سەر ماڵەکەم، هێند به وردیی ماڵەکەم دەگەڕان، دەتوت دڵنیان لەوەی که بڵاوکراوه و بەیانات له ماڵەکەمدا هەیه! لێرەوه من نەک هەر هەست دەکەم بەڵکو دڵنیایشم لەوەی فاروق تاکه کەس نەبوو دەستی هەبوو له بەگرتدانی مندا، بەڵکو کەمال زەهاوییش لەم بەگرتدانەدا تێوەگلاوه. بەتایبەتی چونکه مەحموودی دەلاک و خێزانەکەی له من زیاتر کەمال زەهاوییان دەناسی. کەواته کەمال زەهاوی بۆچی منی بەگرتدا، بۆچی مەحموودی دەلاکی به گرت نەدا!

ڕەنگه کەمال بەو جۆره بیریکردبێتەوه که تەنها بەگرتدانی عەلی بەسه، دواتر عەلی له ژێر ئەشکەنجەداندا خۆی ڕاناگرێت و ناوی هەموو هاوڕێ و دۆستەکانی، له ناویشیاندا مەحموودی دەلاک و خێزانەکەی، دەدرکێنێت. هەرچۆنێک بێت، من بۆ خۆشبەختم، له کاتی پشکنینی ماڵەکەمدا، ئەمن نامیلکەکەیان بۆ نەدۆزرایەوه، ئیتر له بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنەکانی سلێمانی و تکریت و بەغدا و له کاتی بەقسەهێنان و لێپێچینەوه و ئەشکەنجەداندا، چەند تێهەڵدرام و هەڵواسرام و بیرازکرام، نەچوومه ژێر باری ئەوەی هیچ بڕه پارەیەکم دابێت به ناو فاروقێک که من له بنەڕەتدا نه دوور و نزیک دەیناسم و نه دەیشزانم کێیه.

هەڵبەتە تا بەر لە بە گرتن دانم، یان دەستگیرکرانم، پەیوەندیم لەگەڵ ئەو لقەی پێشمەرگەی حیزبدا هەبوو کە ئەسعەد گامێشتەپەیی سەروکار و سەرپەرشتیی دەکرد. سەبارەت بە هۆکار و مێژووی خۆفرۆشتنی ئەم جووتە برایەیش بە ئەمن، هیچ زانیارییەکم نییە، هێندە هەیە کە دەوترێت یەکێکیان، واتە عومەر کە ناسراو بوو بە (ئازاد)، لەپاش پێکرانی لە شەڕی سۆیلەمیش و لەدەستدانی چاوێکی لەو شەڕەدا، چووە بە قیندا و دڵی ڕەش بووە لە حیزبی شیوعی و خۆی فرۆشتووە بە ئەمن و لەگەڵ دەستتێکەڵکردنیشدا لەگەڵ ئەمن دەستی براکەیی گرتووە و ئەویشی بردووەتە ناو ئەمنەوە.

## یان حیزب یان خوێندن

لە ساڵانی حەفتادا، بڕیارمدا سەرلەنوێ دەست بدەمەوە خوێندن و بچمەوە قوتابخانە. کاتی خۆی بە هۆی دەستکورتیی خێزانەکەمان و سەرقاڵیی بە نانپەیداکردن بە کرێکاریی و نەقاڕیی، دەستم لێهەڵگرتبوو. بەڵام هەر لەو کاتانەدا و لەو سۆنگەیەوە کە لێپرسراوی ڕێکخراوی حیزب بووم لە کارگەی جگەرەی سلێمانی و وەک پیشەیش فەرمانبەر بووم لە کتێبخانەی گشتیی سلێمانی، ئەحمەدی مارف، کە ئەندامی مەکتەبی محەلیی حیزب و بەرپرسی یەکەمی هێڵی کرێکاران بوو، واتە بەرپرسی منیش بوو، پێیوتم: یەکێکیان هەڵبژێرە، حیزب یان خوێندن. منیش چووم حیزبم هەڵبژارد. ئیتر لەو کاتەوە تێگەیشتم لەوەی کە حیزب ئەوەندەی کە ئیشی بە نەخوێندەوار دەڕوات، ئەوەندە کاری بە خوێندەوار ناڕوات.

## کاتێك کە حیزب شیوعییەتی خستە سواڵ

ئەو بەشەی کە حیزبی شیوعی لە بەرەی کوردستانی بەری دەکـەوت، لـەو بەشە زیاتر بوو کە دواتـر و تا ئێستایش لە حکومەت بەری دەکەوێت. هەر بۆیە حیزب، بە هەڵوەشاندنەوەی بەرەی کوردستانی، بێتاقەت و نیگەران بوو. ئافەرین حیزب، خاوەنی باوەڕ و ئایدیۆلۆژیایەک بیت کە ئامراز و میکانیزمێکی کاریگەری شۆڕش و خەباتی چینایەتیی و جوڵاندنی شەقام و گرتنەخۆی نارەزایی خەڵکیی و هاندانی جەماوەر بێت و لە وڵاتێکدا بژیت کە پڕی بێت لە نادادیی و نایەکسانیی و هەژاریی و کەمدەستیی، کەچی بچیت ئەو باوەڕ و ئایدیۆلۆژیایە بۆ دەرۆزە و دەستپانکردنەوە لە یەکێتی و پارتی و سواڵی کورسییەکی پەڕلەمان و وەزارەتێکی حکومەتی هەرێم بەکاربهێنی!

## دیسان بەرپرسە کوونییەکە

سوهێل زەهـاوی، کە بە کەمال زەهاوی-یش ناسراوە، بە ڕەچەڵەک کوردی فەیلی خەڵکی خانەقینە، لە دەهەی حەفتای سـەدەی پێشوودا لێپرسراوی ڕێکخراوی قوتابیانی حیزب بوو، بە تایبەتی قوتابیانی زانکۆ، نەخاسمە لەو ساڵانەدا کە حیزبی شیوعی کار و چالاکیی سیاسی بە ئاشکرا ئەنجام دەدا سەروەختێک کە لە ساڵی ١٩٧٣ تا ساڵی ١٩٧٩ لەگەڵ حیزبی بەعس لە بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتنخوازدا بوو. دیاربوو کە کەمال زەهاوی هەر لەو سەردەمەوە خۆی فرۆشتبوو بە بەعس، چونکە وەک باس دەکرێت ئەو کاتەی کە لە دەهەی هەشتادا کەمال بە نهێنیی وەک لێپرسراوی ڕێکخراوە نهێنییەکانی حیزب

له سلێمانی کاری کردووه، چەندین جار لەگەڵ مولازم موحسین بینراوە. بەتایبەتی مەحموودی دەلاک کەماڵیان لە شەقامی کاوە بوو و لە خانوویەکدا نیشتەجێبوو کە نهۆمی ژێرەوەی گەراج بوو، بە زاری خۆی و زیاد لە جارێک بۆیگێڕاومەتەوە کە چەندین جار مولازم موحسینی بینیوە هاتووە بۆ لای کەمال زەهاوی و لە گەراجەکە یەکترییان بینیوە و پێکەوە قسەیان کردووە.

من ڕاستیی ئەو پەیوەندییەی کەمالم بە ڕژێمەوە ئەو کاتە زیاتر بۆ دەرکەوت کە لەدوای پرۆسەی داگیرکردنی عێراق لە ۲۰۰۳دا کاتێک کە لە گرتنی ئەمنی بەغدا فایلەکەی دەکەوێتە دەست حیزب، هەندێک لە بەرپرسانی حیزب لەبری ئەوەی کەمال دەستگیربکەن و لێیبپرسنەوە و لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکەن و سزای بدەن، فریای دەکەون و داوای لێدەکەن کوردستان جێبهێڵێت و بڕوات بۆ هەندەران، هەڵبەتە مەبەستم لەو هەندە بەرپرسە، سوبحی مەهدی بەرپرسی ئەوکاتی محەلیی سلێمانی و کەمال شاکیر سکرتێری حیزب و حەیدەر فەیلی ئەندامی مەکتەبی سیاسی و ئاوەڵزاوای کەمال زەهاوییە.

لەپاش ئازادبوونم لە زیندان، چەندین جار بە داوا داوام لە حیزب کرد دانیشتنێکمان بۆ ساز بکەن تێیدا من و کەمال زەهاوی ڕووبەڕووی یەکدی بکەنەوە، تاکو بۆیان بسەلمێنم کە لەگەڵ فاروقی کوڕی حەمە عەلی عازەبانیی عەریفی پۆلیسدا کەمال زەهاوییش دەست و دەوری هەیە لە بەگرتدانمدا، بەڵام حیزب چونکە دەستڕۆیشتووانیان بەرژەوەندییان نەبوو لە ئاشکرابوونی کەمال زەهاویدا لە ترسی ئەوەی نەبا خۆیشیان

ئاشکرابین، داواکەمیان بە فەرامۆشیی سپارد. من پێموایە وەک چۆن لە ١٩٦٧دا عەزیز حاج کە کوردی فەیلی بوو، ڕۆڵێکی خراپی گێڕا لە کەرتکردن و زەلیل و لاوازکردنی حیزبی شیوعیدا بۆ حیزبی بەعس و لەدواییشدا تۆبەی کرد و چووە باوەشی بەعس، بەرپرسانی لە نموونەی کەمال شاکیر و حەیدەر فەیلی و کەمال زەهاوی، ڕۆڵیان کەمتر نەبوو لە لاوازکردنی حیزبی شیوعی کوردستاندا. بەڵێ کەمال زەهاوی نەک هەر بەرپرسێکی کوونیی بوو، بەڵکو پیاوی مولازم موحسین بوو و ڕۆڵی هەبوو لە بەگرتدانی مندا کە سەرەنجام لە ژێر ئازار و ئێشی ئەشکەنجەدانی گرتووخانەکانی ئەمندا هەردو چاوم لەدەستدا و دەبێت تا بە یەکجاریی سەردەنێمەوە بە نابینایی ژیان بە سەر ببەم.

بابەتێکی دیکە کە ڕۆڵی کەمال زەهاوی لە بەگرتدانی مندا دەردەخات، کوشتنی عومەری برای فاروق، ناسراو بە ئازادە، لەدوای کۆڕەوەکە و لەلایەن دەستڕۆیشتووانی ئەوکاتی حیزبەوە، هەم بۆ شوێنبزرکردنی ڕۆڵی کەمال زەهاوی لە ناپاکیی بەگرتدانی هاوڕێکەیدا و هەم بۆ ئەوەی کۆی ئۆباڵی تاوانی ناپاکییەکە بخەنە ئەستۆی عومەر و لە ڕێگای لەناوبردنییەوە بەیەکجاریی سەری باسی دۆزەکە بنێنەوە و دۆسیێی ناپاکییەکە دابخەن.

## ڕێکەوتێکی سەیر

ساڵی١٩٩٣، لە ڕێگای خزمایەتیکردن و ژن و ژنخوازییەوە، تێکەڵ بە خێزانێکی لە بەری دایکەوە سەر بە بنەماڵەی بابانەکان بووین. خێزانی نەسرین شەوکەت عەزمی بەگ بابان، کە ژنی پیاوێک بوو لە کارگەی جگەرەی سلێمانی فەرمانبەر بوو و

ناوی سەلاح عەبدوڵلا بوو و ناسراو بوو بە سەلاح سەموون.

ڕاستییەکەی، لەپاش تێکەڵبوون و خزمایەتیکردن ئینجا بە چاکیی یەکتریمان ناسی. دەربارەی سەلاح-ی مێردی نەسرین خان، لەلایەک دەوترا کاتی خۆی، واتە لە شەست و حەفتاکان، سەلاح سەموون سەر بە پارتی بووە و لێپرسراوی دارایی پارتی بووە لە سلێمانی و لەلایەکی تر باس لەوە دەکرا کە لەدوای ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥ وازی لە پارتی هێناوە و بووەتە بەعسی. جا ئەم سەلاحە یەکێکە لەو کەسانە کە کاتی خۆی و لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٧٩دا ئاسۆی دەلاک لە کردەیەکی تایبەتدا لە بەر دەم ماڵەکەی خۆیاندا و بە تۆمەتی بەعسیبوون کوشتویەتی.

نەسرین خان، پاش ئەوەی بووین بە خزم، سەبارەت بە باسی کوشتنی مێردەکەی جارێکیان بە زاری خۆی بەسەرهاتەکەی بۆگێڕامەوە و وتی: کاتەکەی بەیانی بوو، لەو وەختەدا کە قوتابیان و فەرمانبەر و مامۆستایان دەچنە سەر ئیش و کار و قوتابخانە، لەگەڵ سەلاح لە بەر دەرگای ماڵی خۆمان مناڵەکانمان بەڕێ دەکرد بۆ قوتابخانە، کاتێکم زانی کوڕێکی گەنج کە نەمزانی چۆن لە کۆڵانەکەماندا پەیدابوو و لە کوێوە هات، لە بەر دەم سەلاح-دا قوت بووەوە و دەمانچەی دەرهێنا و چەند فیشەکێکی نا بە سەلاحەوە و بە خێرایی هەڵهات و لە چاو بزر بوو.

نەسرین خان دەیوت ڕووداوەکە ئەوەندە کتوپڕ بوو، فریای هیچ نەکەوتین و سەلاح لە شوێنی خۆی و دەسبەجێ گیانی لەدەستدا. بەلام لە کاتی تەقەکردنەکەدا چونکە من لە سەلاحەوە

نزیکبووم سەر و سیمای گەنجەکەم زۆر بە چاکیی بینی بەڵام نەمزانی کێ بوو.

لەدوای تێپەڕبوونی چەند مانگێک بە سەر ڕووداوی کوشتنی سەلاح-دا، گێڕانەوەکە دیسان هینی نەسرین خانە: ڕۆژێکیان لە ئەمنی سلێمانییەوە تەلەفونمان بۆ کرا. خۆم وەڵامی پەیوەندییە تەلەفونییەکەم دایەوە. قسەکەرەکە ئەمنێک بوو، لەپاش سڵاو وتی: من لە بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی سلێمانییەوە پەیوەندیی دەکەم، پێویستە کە هەر ئەمڕۆ بۆ هەندێک کاری پێویست سەردانمان بکەن بۆ ئەمنی سلێمانی. وتم: خێرە؟! وتی: کاتێک کە هاتیت دەزانیت بۆچی داواتان دەکەین.

نەسرین خان دەیوت: لەلایەک حەزم نەدەکرد بە دەنگ داواکەوە بچم و بڕۆم بۆ ئەمن، لەلایەکی تر هۆکاری بانگکردنەکە بوو بوو بە مەراقم. هەرچۆنێک بوو کارەکەم دوانەخست و لە کاتی خۆیدا سەردانی بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنم کرد. کاتێک کە چوومە ئەوێ بردیانمە لای بەڕێوەبەر، بەڕێوەبەر دوای ئەوەی کە بە خێری هێنام لە سەر کورسییەکەی لە شوێنی دانیشتنەکەی هەستا و وتی: بە ئەرک نەبێت وەرە با پێکەوە تا ئەو ژوورە بچین. هەستام و لەگەڵی ڕۆیشتم، بە ڕاڕەوێک و بە بەر دەم چەند ژوورێکدا ڕەتبووین تا گەیشتینە بەر دەم ژوورێک، بەڕێوەبەر خۆی کرد بە ژوورەکەدا و فەرمووی هاتنە ژوورەوەی لە منیش کرد. کاتێک کە چوومە ژوورەوە ژمارەیەک ئەمن کە خۆیان لە شەش حەوت ئەمن دەدا، لە ژوورەکەدا و لە دەوروخولی کەسێک کۆبووبوونەوە کە لە سەر کورسییەک دانیشێنرابوو و هەردو قاچی بە قاچەکانی

کورسییەکە و هەردو دەستیشی بە دەسکەکانی کورسییەکەوە بەسترابوو و ئەو جلوبەرگەی کە لەبەریدابوو هەمووی دڕابوو و سەرتاپای خوێن بوو. یەکێک لەو ئەمنانە کە لە ژوورەکەدا بوون، مولازم موحسین بوو. تەنها لەو کاتەدا زانیم کە ئەمن منیان بۆ بینینی ئەم کەسە بانگکردووە کە لە سەر ئەو کورسییە دانیشێنراوە و پێوەی شەتەکدراوە. گەنجەکە. لەبەرئەوەی کە ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر درابوو و نیوە ڕۆح یاخود نیوەهۆش کرابوو و ئاگای لە خۆی نەبوو، لە شەکەتیدا سەری خستبووە باوەشییەوە. لەم کاتەدا مولازم موحسین وتی: بۆ ئەوە بانگمانکردویت تاوەکو پێت بڵێین بەڕێزت ئەم زەلامە دەناسیت؟ مولازم موحسین بەدەم قسەکردنەوە لە گەنجەکە نزیکبووەوە و چووە لاتەنیشتییەوە و چنگی کرد بە پرچی گەنجەکەدا و سەری پێ بەرزکردەوە و ڕووخساری پێ نیشاندام و وتی ئا ئەم زەلامە دەناسیت؟

کاتێک کە بە وردیی سەرنجی دەموچاوی گەنجەکەم دا، ئەگەرچی ڕووخساریشی لە ئەنجامی لێدان و ئەشکەنجەدان زامدار و خوێناویی بوو بوو، بەڵام دەسبەجێ ناسیمەوە و وتم: بەڵێ دەیناسمەوە، ئەوە ئەو گەنجەیە کە ڕۆژی ٢٨ی مانگی دووی ساڵی١٩٧٩ لە بەر دەرکی ماڵی خۆمان سەلاحی مێردمی کوشت. مولازم موحسین وتی: ئەمە ناوی ئاسۆی دەلاک-ە، سەر بە ئیتحادی وەتەنی عەمیلە و کاری کوشتن و تیرۆری خەڵکی بێگوناهی بۆ ئەو تێکدەرانە دەکرد لە ناو شاردا، ماوەیەکی کەم لەمەوبەر لە کردەیەکی دەمنیی تایبەتدا لە ناو شار دەستگیرمان کرد، خەمت نەبێت تۆڵەی مێردەکەی

تۆ و هینی هەموو ئەو بێتاوانانەیشی لێ دەستێنین کە بە ناهەق کوشتونی. لەدوای ئەوە، نەسرین خان گێڕایەوە، بەڕێوەبەری ئەمن و مولازم موحسین سوپاسی ئەزێتکێشانی هاتنمیان کرد بۆ ئەمن و وتیان: سوپاس بۆ هاتنت و تەواو ئیشمان پێت نەما دەتوانیت بڕۆیت، خوات لەگەڵ.

## ئەگەر خودا پێمی ببەخشێتەوە

سامال، منالی بەر لە کۆتا منالم بوو، ساڵی١٩٧٦ لە گەڕەکی گۆیژە هاتە دونیاوە. لەبەر ئەو ئاواز و کاریگەرییە ئایدیۆلۆژییەی کە وشەی هەژار لە سەرم هەیبوو، لە خۆشەویستییدا بە (بێنەوا) بانگم دەکرد. ئەو ڕۆژگار و دەورەی کە سامال تێیدا لەدایک بوو، ڕۆژگاری شکستی شۆڕشی کوردیی ژێر بەیداخی پارتی و بارزانی بوو. ساڵی بەرتر، واتە ساڵی ١٩٧٥، خەڵکێکی زۆری پێشمەرگە، بە هۆی ئاشبەتاڵی شۆڕشەکەوە، نائومێدبوون و گەڕانەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان و دەستیان لە پێشمەرگایەتی هەڵگرت، بۆیە کەسانێکی خزم و خوێش، کە نسکۆی شۆڕشەکە لە ناخەوە بریندار کردبوون، لە نازناوەکەی سامال، واتە بێنەوا، ناتۆرە و توانج لە خۆیان تێگەیشتبوون. پێیانوابوو کە منیش، دەنگی خۆم خستووەتە پاڵ دەنگی ڕژێم لەو کاتەدا کە داوای وازهێنانی پێشمەرگەی دەکرد لە پارتی و لە شۆڕشی کورد و منیش ڕژێمئاسا بانگ و داوا لە پێشمەرگە دەکەم کە بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵ و ناو کەس و کاریان و خۆیان ڕادەست بکەنەوە، بۆیە کوڕەکەمم ناو لێ ناوە (بێنەوە) نەک (بێنەوا) واتە: وەرنەوە، خۆتان ڕادەست بکەنەوە!

بەهەرحاڵ، غەدری ڕۆژگار وا بوو کە ساماڵ پتر لە شەش ساڵ تەمەنی نەکرد و لە ساڵی ١٩٨٢دا، بە هۆی هەڵەلێدانی دەرزییەوە، مرد. پوختەی چیرۆکی گیان لەدەستدانەکەیشی بەو شێوەیە بوو کە ئەوێ ڕۆژێ ساماڵ ناساغ بوو، لەو کۆڵانەی گەڕەکی گۆیژە کە ماڵەکەمان لەوێ بوو، ماڵێکی کریستیان هەبوو، ژنێکی ماڵەکە هەر لە ماڵەکەیاندا کاری یاریدەدەرێتیی پزیشکیی دەکرد و هەر کەس پێویستیی بکەوتایەتە دەرزییەک یاخود دەرمانێک، سەردانی ئەو ماڵەی دەکرد. ئێمەیش ڕێکەوت ئەو ڕۆژەی ساڵی ١٩٨٢ ساماڵ ناساغ بوو، بۆ ئەوە بردمان بۆ لای ژنەی برینپێچ تاکو دەرزییەکی بۆ بکات بەڵکو چاکببێتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی کە ژنە دەرزییەکەی بە هەڵە لێدا، ئەفسوس کە ساماڵ، لەبری چاکبوونەوە، بە یەکجاریی جێیهێشتین و کۆچی دوایی کرد.

لەدوای ئەم ڕووداوە جەرگبڕ و چاوەڕواننەکراوە، خەڵکانێک هەم لە دۆست و هەم لە خزم و ناسیاوان، داوایانلێکردم هەرچی زووە لە بنکەی پۆلیس داوا لە سەر ژنەی برینپێچ تۆماربکەم و مافی خۆمی لێوەربگرمەوە، بەڵام من، لە سۆنگەی بڕوابوونمەوە بەوەی کە هەرچییەک بکەم ساماڵم بۆ ناگەڕێنرێتەوە و تازە بەیەگجاریی لەدەستمدا، داواکەیانم ڕەتدایەوە و وتم: ئەگەر خودا ساماڵم پێببەخشێتەوە، بۆ نا، داوا لە سەر ژنەی برینپێچ تۆماردەکەم. مەبەستم ئەوە بوو کە ئەگەر بەو داوا تۆمارکردنە سەبووریيم دێت و لە پەژارە و خەمم کەمدەبێتەوە، بۆ نا، بەڵێ داوا تۆمار دەکەم، بەڵام چونکە ئەو کارەی کە ئەو ژنە کردی دەست ئەنقەست نەبوو، بە هیچ چەشنێک بیرم لەوە

نەکردەوە کە لە ڕێگای داوا لە سەر تۆمارکردنەوە، تۆڵەی کوڕەکەمی لێ بستێنمەوە. گەرچی من هەر لە بنەڕەتدا باوەڕم بە کاری تۆڵەسەندنەوە نییە، بەڵام لانیکەم تۆڵەسەندنەوە دەبێت لەپای کاری ئازاردان و کوشتنی دەستئەنقەست بێت نەک لە کاردانەوەی کاری دەستنائەنقەستدا. لەم سۆنگەیەوە لە ژنەی بکوژی کوڕەکەم، یاخود با بڵێین بکوژی دەستنائەنقەستی کوڕەکەم، خۆش بووم و لەم لێخۆشبوونەیشی پەشیمان نەبووم و پەشیمانیش نیم.

## بەرگرییەکی دلێرانە

ئەو باڵەی کە لە کەرتبوونەکەی عەزیز حاج مابوو تا ساڵانی حەفتا، لەم کەسانە پێکدەهات: شێخ عەلی نائیب زابت برای مامۆستا شێخ باقر، شێخ حامید بەرزنجی کە لە کارگەی جگەرە بوو، فاروقی مەلا مستەفا، مەلا عەزیزی نەقارڕ، حەمە سدیقی پارێزەر، حەمە مستەفا پارێزەر، ئەحمەد میرزا، عەلی باراوی، تەها خەلیل.

ئێوارەیەک کتوپڕ کامیلی معاونی پۆلیس گەڕی بە شێخ عەلی کرد و بە دەستەیەک پۆلیسەوە چووە سەر ماڵەکەی تاکو قۆڵبەستی بکات و بیبات ڕادەستی حکومەتی ئەوکاتی بکات کە پارتی بوو. بەڵام شێخ عەلی وەک دەڵێن مارانگاز لە خشەی مار و مێرو دەترسێت، ئەسپێکی هەبوو لە ماڵەوە دایم زینی پێوە بوو، شێخ عەلی زۆر داوا لە معاون کامیل دەکات کە شەڕی لێ لا بدات، بەڵام دیاربوو معاون کامیل هاتبوو باڵی شێخ عەلی ببەستێت و بیبات، هەر بۆیە ئەو سەرەی کە هێنابووی نەیبردە دواوە.

لەم دەنگە دەنگ و بگرە و بەردەیەدا پۆلیسەکان پەلاماری ماڵەکەی شێخ عەلی دەدەن، ئەویش کە لە ماڵەوە تفەنگێکی کلاشنیکۆفی هەبوو، لە پۆلیسەکان و معاون کامیل دێتە دەست و دەستڕێژێک گوللە دەکات بە ناویاندا و معاون کامیل بریندار دەبێت، لەم کاتەدا شێخ عەلی سواری ئەسپەکەی دەبێت و هەڵدێت.

ئەو باڵەی کە سەر بە عەزیز حاج بوو، ئەوەی کە بۆی کرا کردی و لەدواییدا سلێمانی بەرەو گەلاڵە جێهێشت.

## (یەمین)ی گەواد چۆنە؟!

ڕۆژێکی نیوەڕۆی کۆتا ساڵی هەشتاکان، بەر لە دەستگیرکردنم، دوای لێبوونەوە لە دەوام لە کارگێڕیی خۆجێیەتی، لە فەرمانگە هاتمە دەرەوە و یەکسەر چوومە ئەوبەر بۆ نزیک دووکانەکەی جەرجیس کە بەرەو سابوونکەران هەڵدەگەڕێت، لەو بەر دەمە لە بەر دەم جەرجیس کوڕێک ڕۆژنامەی دەفرۆشت و ڕۆژنامەکانی لە سەر ئەرزەکە دادەنا، ڕۆژنامەیەکی عێراق و دانەیەکی هاوکاریم لێ کڕی و بەرەو ئەسحابەسپی بۆ سواربوونی پاسی سەرچنار بەرەو ماڵەوە کە ماڵمان لە گەڕەکی ڕزگاری بوو گەڕامەوە.

لە بەرانبەر گەراجی مەسڵەحەکە لە پاس دابەزیم و لە شەقام پەڕیمەوە و بە تەنیشت مونەزەمەی حەتینی حیزبی بەعس (کە ئێستا مەڵبەندی یەکی ڕێکخستنی سلێمانیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان-ە) ڕووەو ماڵەوە داگەڕامە خوارەوە. لەو بەر دەمەی مونەزەمەدا لە ئەمبەری لاتەنیشتی شەقامەکەوە

ئۆتۆمبێلێک ڕاوەستابوو کەسێک لە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە: عەلی عەلی بانگی لێکردم، تەماشا دەکەم فاروقی مەلا مستەفایە. گازی کردم و بە دەم وەرگرتنی ڕۆژنامەکانەوە لە دەستم و چاوخشاندن بە نێوانی لاپەڕەکانیاندا بە خێرایی، وەک ئەوەی بۆ بەیاننامەیەک یان بڵاوکراوەیەکی حیزبی شیوعی بگەڕێت کە من کردبومە باو و زۆر جار لە نێوان لاپەڕەکانی ڕۆژنامە یاخود کتێبێکدا دامدەنان، کەوتە هەواڵپرسین و وتی: یەمینی گەواد چۆنە؟! مەبەستی لە یەمینی گەواد (ڕاستڕەوی گەواد) حیزبی شیوعی عێراق بوو، کە هەروەها باڵەکەی عەزیز حاج بە حیزبە سۆشیال دیموکراتەکەی بەهادین نوری-یش ناوی دەبرد. منیش وتم: هەواڵم لێیان نییە. ئینجا من لێمپرسی: ئەی خێرە کە تۆ لێرە لە بەر دەم مونەزەمەی حەتین-دا ڕاوەستاویت؟ وتی: چاوەڕێی برادەرێکم دەکەم تا مونەزەمە چووە و دەگەڕێتەوە.

هاوڕێیەکی زیندانم لە دواییدا بۆیگێڕامەوە و وتی: ڕۆژی ٢٧ی مانگی شەشی ساڵی ١٩٨٩، کە ئێوەیان لە ئەمنی سلێمانییەوە بەرەو ئەمنی بەغدا گواستەوە، فاروقی مەلا مستەفایان هێنا بۆ ئەو ژوورەی ئێوە لە ئەمنی سلێمانی و یەک دوو شەوێک لەوێ مایەوە، بەڵام نەمزانی کە هۆکاری هێنان یاخود دەستگیرکردنەکەی چی بوو.

حیزبی شیوعی عێراق، کە ئەوکات دژ بە دڕندەترین ڕژێمی فاشیستیی ناوچەکە کە حیزبی بەعس بوو، لە تێکۆشانێکی دژواردا بوو، لەلایەن ئەو کەسانەوە کە خۆیان بە شۆڕشگێڕی بیرکابەر و چەپڕەوی بێهاوتا دادەنا و ئێستایش بە هەمان چەشن لە خۆیان دەڕوانن، بە ڕاستڕەو و سۆشیال دیموکرات ناودەبرا،

بەڵام ئەم شۆڕشگێڕ و چەپڕەوانە خۆیان لە دەهەی هەشتادا، کە سەختترین دەهـەی تێکۆشان و خەبات بوو لە مێژووی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی کـورددا، کە حیزبی شیوعییش بەشێک بوو لەو بزووتنەوەیە، لەبری بەرەنگاریی و تێکۆشان و خەبات، سەرقاڵی سەرمایەگوزاریی و خۆدەوڵەمەندکردن بوون!

## نامەکەی عەلی کەمال

عەزیز شەفیق، کە کاتی خۆی یاریدەدەری پۆلیس بوو و دواتر گوازرایەوە بۆ کارگێڕیی خۆجێییەتی، خۆی بۆیگێڕامەوە وتی: لە ساڵانی شەستدا کە قوتابی بووین لە ئامادەیی، بەتایبەتی لەگەڵ قادر شەریف، ناسراو بە قالەی شەفە کوردە سمایلعوزێری، لەگەڵ چەند قوتابییەکی تردا بانگیان کردین بۆ چەرمەگا بۆ لای حاجی برایم، حاجی برایم وتی: بۆ ئەوە بانگم کردون تا پێتانڕابگەیەنم کە نامەیەکم بۆ هاتووە لە عەلی کەمالەوە لە بەغدا، داوای لێ کـردوم کە چەند لاوێکی خوێنگەرمی کورد ئامادەبکەم بەڵکو بتوانین لە ڕێگای لەناوبردنی عەبدولکەریم قاسمەوە شتێک بۆ کورد دەستەبەر بکەین.

## عیسا سوار

مانگی ئابی ساڵی ١٩٧٣، دوانـزە کـادری حیزبی شیوعی عێراق، کە لە دەوڵەتانی ئەوروپای خۆرهەڵات و یەکێتیی سۆڤیەت دەگەڕانەوە، لەپاش خوێندنی خولێکی کادریی کە لەو وڵاتانە بە سەرکەوتوویی تەواویانکردبوو. ئەم دوانزە کادرە، کە زۆربەیان گەنجی تازەلاو و خوێنگەرم بوون، کاتێک کە لە ڕێگای زاخۆوە

دێنەوە سەر خاکی کوردستانی عێراق، لەلایەن فەرماندەی ئامر هێزی زاخۆی ئەوکاتی پارتی: عیسا سوار، یەخسیر و پاشان سەرنگووم دەکرێن! تەنها تاوانێکی ئەم گەنجانە، ئەگەر تاوانێکیان کە هەبووبێت، ئەوە بوو کە ئەندامی حیزبی شیوعی بوون. ئەمە ناوی هەندێک لەو گەنجە غەدرلێکراوانەیە:

١-هیشام مەحموود، خەڵکی پارێزگای بەسرە.

٢-نەجمەدین عوسمان سالّح، خەڵکی پارێزگای سلێمانی.

٣-نورەدین ئەحمەد، کەرکووک.

٤-شیروان جەمیل باڵتە، خەڵکی دهۆک.

٥-محەمەد عەبدولئەمیر موتەیری، خەڵکی کەربەلا. ئەم غەدرلێکراوە خاوەنی کۆشێک مناڵ بوو.

٦-عومەر قادر ئەحمەد، خەڵکی سلێمانی.

٧-مزهەر کرێدی، خەلکی ناسرییە.

٨-محەمەد ناسر، خەلکی کوفە.

٩-ڕەبیع عەبد ناجی، خەڵکی شەترە.

١٠-فازڵ عەبدولساحیب موسەوی، خەڵکی بەسرە.

١١-عەبدوڵڵا مەهدی مەنسوری، خەڵکی بەسرە.

١٢-؟

بەداخەوە ناوێکیانم لە یاد نەماوە. ئەوکات، بە هۆی ئەو بەرە سیاسییەوە کە حیزبی شیوعی لەگەڵ حیزبی بەعسدا هەیبوو، پارتی بە ڕاست و چەپدا کەوتبووە دژایەتی و دوژمنایەتیکردنی حیزبی شیوعی و لە هەر شوێن و جێیەک دەستی بگەیشتایە و بڕۆیشتایە، شیوعییەکانی دەکوشت. ئەم ڕفاندن و تیرۆر و کوشتنە کە پارتی لە دەهەی حەفتادا بەرانبەر بە شیوعییەکان

پیادەی دەکرد، نەک هەر بەو تیرۆرەی شیوعییەکان دەچوو لە دەهەی شەستاکاندا لە سلێمانی، کە دیسان پاڵەوانی کوشت و بڕ و تیرۆرەکە هەر پارتی بوو و کە بە (کانیی ماسی) و (کانیی ساردی) ناوی چووەتە مێژووەوە، بەڵکو درێژکراوەی ئەو تیرۆرەیش بوو، ترس و سامێک بوو کە پارتی بەرانبەر بە بووژانەوە و ژیانەوەی حیزبی شیوعی لێی نیشتبوو.

ئەوەی کە مایەی سەرسوڕمان و شایانی هەڵوەستە لە سەر کردنە، ئەوەیە کە تا ئێستایش ئەو دوازدە کادرەی حیزبی شیوعی بێسەروشوێنن و نازانرێت پارتی لە کوێ و بە چ شێوەیەکی دڕندانە و لە ژێر ئازار و ئەشکەنجەداندا لەناویبردن. سەرەڕای ئەو پەیوەندییە گەرموگوڕەی کە سەرکردایەتی حیزبی شیوعی لەگەڵ سەرانی ئەوسا و ئێستای پارتی هەیانبووە و هەیانە، نە ئەوسا و نە ئێستایش سەرانی حیزب زاتی ئەوەیان کرد، لە ڕێگای ئەو پەیوەندییەیانەوە، سۆراخێکی ئەم ئەندامانەیان بکەن کە بە تاوانی ئەندامێتیی حیزبی شیوعی تیرۆرکران.

پارتی، هەر نەبووایە دەبوو بە فەرمی هەم داوای لێبووردنی لەو کارە چەپەڵەی بکردایە و هەمیش ئێسک و پروسکی لاشەکانیانی ڕادەستی حیزب و کەسوکارەکەیان بکردایەتەوە، یاخود شوێنی ناشتنیانی ئاشکرا بکردایە، ئەگەر ئەوە ڕاست نییە کە دەوترێت: پارتی ئەم کادرانەی بە چاو و پەلی بەستراو و بە زیندوویی لە سەر شاخ بەرداوەتە خوارەوە و لاشەکانیانی، لە دۆڵ و کەندڕەکانی کوردستان، بۆ بەزەیی قەل و داڵ و سیسارکەکان جێهێشتووە!

## بیانکوژن و بڕایەوە

دیسان عەزیز شەفیق خۆی گێڕایەوە و وتی: ساڵانی شەست، سەردەمانێک کە ئامر هێزی شۆڕشی ئەیلول بووم لە گەرمیان و قەرەداغ، ڕۆژێکیان چەند پێشمەرگەیەک هاتن بۆ لام و وتیان: چوار کەسی شیوعیمان دەستگیرکردووە، چییان لێ بکەین؟. عەزیز وتی: منیش پێموتن قابیلە چییان لێ دەکەن، بیانکوژن و بڕایەوە.

## مەنجەڵێك یاپراخ بەشیان دەکات

دەستەواژەی (مەنجەڵێک یاپراخ بەشیان دەکات) کە مەبەست لێی (کەمن) یاخود (ژمارەیان کەمە)یە، لە بنەڕەتی زمانەوانییدا یاخود لە باری زمانەوانییەوە، ئیدیۆم یاخود زاراوەیەکی زمانەوانییە، بەڵام زاراوەیەکی ڕەگەزپەرستانە و فاشیستانەیە. ئەو نەژادپەرستییەی کە لەم زاراوەیە دەچۆڕێت، لەڕاستییدا نەژادپەرستییەکی سیاسییە و پەیوەندیی بە هەڵاوێردی سیاسییەوە هەیە. پتر لەدوای ڕاپەڕینی ئاداری ساڵی١٩٩١ ئەم دەربڕینە کەوتە سەر زاران و بوو بە بنێشتەخۆشەی بن ددانی خەڵکی گجە و ڕەشۆکی شوێنکەوتەی پارتە سیاسییە نەتەوەییەکان.

ئەو دەستە و گروپە سیاسییە کە ئەم دەستەواژەیەی وەک ناتۆرە و تانە و تەشەرێک بەرانبەر بەکاردەهێنرا، حیزبی شیوعی و شیوعییەکانی کۆمەڵی کوردەواریی بوون و لانکی دەستەواژەکەیش شاری سلێمانییە، کە سەردەمانێک و بەر لە چەوساندنەوەی گروپە سیاسییەکان و بەتایبەتی دەستەی

شیوعییەکان، بەپلەی نایاب شوێنی چەوساندنەوەی کەمایەتییە ئایینییەکان و بەتایبەتی ئایینیی جوولەکە بوو. جوێنی (لە دینت بەم) و (بە ڕیشی مەردانەت قەسەم)، جوێن و ناتۆرەیەکن کە من بۆ خۆم لەگەڵیاندا ژیاوم و لە نزیکەوە لە زاری شارنشینانی بە ئایین موسڵمانی شارەکەمم بیستووە کە بەردەوام بە هاوشارییە بە ئایین جووەکانی خۆیانیان دەوت.

بەڵام سەردەمانێک، کە دەتوانم بە دەهەی شەستی سەدەی پێشوو دەستنیشانی بکەم، حیزبی شیوعی وەک قەوارەیەکی سیاسی، لە ڕووی پێگەی جەماوەرییەوە، نەک هەر کەمینە و کەمایەتی نەبوو، بەڵکو زۆرینە و زۆرایەتی بوو، کەم کەس هەبوون کە لەو ڕۆژگارەدا هەواداری ئەو حیزبە نەبووبن. ئیتر ئەمە پەیوەندیی بە مۆدێلی سەردەم و باوی ڕۆژگارەوە هەبوو یان چی، ئەوەیان باسێکی ترە.

وەک چۆن شوێنکەوتنی کۆمۆنیزم و حیزبی شیوعی باوی ئەو سەردەم و ڕۆژگارە بوو، بەربەرەکانێ و بەرهەڵستییکردنیشی دیسان هەر باوی ئەو سەردەم و ڕۆژگارە بوو، ئەگەر لەسەر ئاستی سیاسەتی جیهان قۆناغی دووەمی ئەم بەرهەڵستی و دژایەتییکردنە بۆ کۆتایی جەنگی دووەمی جیهان و دانانی بەردی بناغەی شەڕی سارد بگەڕێتەوە، ئەوا لەسەر ئاستی ناوخۆ، ناوخۆی عێراق کە مەبەستم لە هەرێمی کوردستان و شاری سلێمانییە بە دیاریکراوی، سەرەتاکەی بۆ ساڵانی دوای سەرکەوتنی شۆڕشی چواردەی تەممووزی ساڵی١٩٥٨ و بەتایبەتی بۆ ساڵانی شەست دەگەڕێتەوە کە هاوکات ساڵانی

زیادبوونی گەشە و نەش و نماکردن و پەلهاویشتنی حیزبی شیوعییشە لە کوردستان.

سیاسەتی پارتی نەتەوەیی کوردیی، چونکە درێژکراوەی سیاسەتی جیهانیی ئەو ڕۆژگارە بوو لە بەرهەڵستییکردن و قەڵاچۆکردنی کۆمۆنیزمدا، لەدوای کودەتای هەشتی شوباتی ١٩٦٣وە لەگەڵ ئەو سیاسەتە جیهانییەدا بەیەکجاریی و بەکردەیی یەکیگرتەوە و قۆڵی دژایەتیکردنی ئەو حیزبەی لێهەڵماڵی. ڕووداوەکانی ئەو سەردەمانەی سلێمانی لە قڕکردنی ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی شیوعی، کە بە کانیی ماسی و کانیی ساردی ناسراوە، باشترین بەڵگەی ئەو ناحەزیی و دوژمنایەتییە بێبەزەییانەیەیە.

بارزانی مستەفا کە نزیک بە دە ساڵ لە ڕووسیای سۆڤیەتی بردبووە سەر، پاش ئەوەی کە شۆڕشی چواردەی تەمموز مەرحەمەتی نواند و مۆڵەتی گەڕانەوەی پێ دا بۆ عێراق، دەهەیەکی لە ڕووسیا بەسەربردبوو بەڵام هێشتا لەوە حاڵیی نەبوو بوو کە کۆمۆنیزم چییە، لەوبارەیەوە پرسیاری لە کەسانێکی وەکو ئیبراهیم ئەحمەد و مام جەلال کردبوو، ئەوانیش، چونکە لە مەترسیی هەڵکشانی جەماوەرێتیی حیزبی شیوعی بۆ سەر پارتی تێگەیشتبوون، وایان تێگەیاندبوو کە تاقمێکی سیاسیین دەیانەوێت هەموو شتێک بکەن بە موڵکی گشتیی، تەنانەت ژن و خێزانەکانیشمان و سڵ لە سەرجێیکردن لەگەڵ خوشک و دایکی خۆیشیان ناکەنەوە. لەبەر قەڵەمڕەویی حیزبی شیوعییش لەو ناوچانەدا کە پێیان دەوترێت سۆرانی و کە دابەشکارییەکی سیاسیی بوو مەلایی و جەلالیی سالانی

شەست کوردستانیان بە سەردا و بەگوێرەی دابەش کردبوو، لە خۆڕا نەبوو کە بارزانی سۆرانییانی بە سۆرەی قووندەر بانگ دەکرد.

سەرەتای دوژمنایەتییکردنی حیزبی شیوعی بە هەڵبەستنی بوختان و درۆ دەربارەی باوەڕەکەیان دەستیپێکرد، لەدواییدا ئەم دوژمنایەتییکردنە بۆ کوشتن و قڕکردنیان سەری کێشا چونکە تاقمێکی سیاسین زەرەر و زیانیان بۆ سەر ڕەوشت و دابی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵ هەیە و پێویستە ڕیشەکێش بکرێن. ئەگەرنا خۆ هیچ ڕۆژێک لە ڕۆژان حیزبی شیوعی دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوای وڵاتی کوردەواریی نەبووە کە دەسەڵاتە سیاسییەکەی ئەزموونکرابێت و شکستیهێنابێت و لەپای خراپیی و گەندەڵییان لە ماوەی دەسەڵاتیاندا ئەوەیان بەسەردا هێنرابێت کە لە سەرەتادا لە ڕووداوەکانی کانیی ماسی و دواتریش لە ڕووداوی کانیی ساردییەکاندا بەسەریاندا هێنرا.

لەم ڕووەوە من پێموایە ئەوەندەی داپڵۆسین و تیرۆری سیاسیی ساڵانی شەست ڕۆڵی هەبوو لە لەقاڵبدان و بچووککردنەوەی حیزبی شیوعیدا وەک قەوارەیەکی سیاسی، ئەوەندە چەوتیی و هەڵەی سیاسی ئەم حیزبە خۆی لەو بچووکبوونەوەیە بەرپرسیار نەبوو، یان ئەگەر بەرپرسیاریش بووبێت بەرپرسیار بوو بەڵام بە ڕادە و ڕێژەیەکی کەمتر.

ڕووداوەکانی کانیی ماسی و کانیی ساردیی و تیرۆر و تۆقاندنی دەهەی حەفتاکان، بە تەنها حیزبی شیوعی لە قاڵب نەدا، بەڵکو خەڵکییشی لە نزیکبوونەوە لە باوەڕی کۆمۆنیزم تۆقاند. لە ئێستادا ئەوەی کە حیزبی شیوعی مەنجەڵێک یاپراخ بەشی دەکات،

تاوانێکە، ئۆباڵەکەی، بە ڕێژەیەکی زۆر، لە ئەستۆی دەرەوەی خۆیدایەتی، لە ئەستۆی پارتە نەتەوەییەکاندایە. بەڵام ئەوەیش کە کەمایەتیبوون و کەمینایەتی بەو چەشنە بە چاوێکی سووک تەماشا دەکرێت، بێجگە لەوەی کە تەماشایەکی ڕەگەزپەرستانەیە، دیدێکیشە کە زۆرایەتیی و قەرەباڵغیی و مێگەلپەرستە و پێیوایە ڕاستیی و ماف لای زۆرایەتییە، لە کاتێکدا کە کۆمۆنیزم وەک باوەڕ و بیر، باوەڕی کەمایەتییە. بەڵام بە دیوێکی تردا ئەوەی کە حیزبی شیوعی مەنجەڵێک یاپراخ بەشی دەکات، چاکە و پەسەندیی وتن و پەسەندان و ستایشکردنی حیزبی شیوعییە، لە کاتێکدا کە هەموومان چارەکە سەدەیەک زیاترە شایەدی چڵێسیی و چاوچنۆکیی پارتی نەتەوەیی کوردیین و بە چاوی خۆمان دەیبینین کە بە هەموو سەروەت و سامان و داهاتی بن زەوی و سەر زەوی وڵاتی کوردەواریی تێرنابن و هیچ شتێک بەشیان ناکات.

## ڕووخانی شانشینی عەرەبیی سعودی

حیزب، لە ساڵانی حەفتادا، بۆ ماوەی دوو هەفتە، خولێکی ڕۆشنبیریی لە هەولێر کردەوە، لە سلێمانییەوە بە دوو ئۆتۆمبێل هەشت نۆ هاوڕێیەک بۆ بەشداریکردن لە خولەکەدا بە ڕێ کەوتین. لە یەکێک لە ڕۆژەکانی خولەکەدا ئەبوسەرباز (مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی) قسەی بۆ کردین. بابەتی باسەکەی بریتی بوو لە شۆڕش و چۆنێتی دەستپێکردنی شۆڕش و مەرجەکانی شۆڕش. شۆڕش لە کوێوە دەستپێدەکات و ئەوەی کە هەموو کەس دەتوانێت بەشداریی تێدا بکات.

من وەک بەشداریێک پرسیارم دەربارەی شۆڕشی کورد بە ڕابەریی بارزانی کرد، پرسیارەکەم لە سەر پارچە کاغەزێک نووسی و دەستادەست ڕەوانەی ئەبوسەربازم کرد. ئەبوسەرباز بە لچێکی هەڵقورچاو و ناوچەوانێکی گرژەوە لە نووسراوی ناو کاغەزەکەی ڕوانی و لە باتی ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەم بداتەوە پرسیاری کرد: ئەم پرسیارە هی کێیە؟ وتم: هینی منە. ئیتر وەڵامی پرسیارەکەمی نەدایەوە.

بەهەرحاڵ ئەبوسەرباز درێژەی بە باسی کۆڕەکەدا کە ئەو ڕۆژە ئەو دەیگێڕا و لە قسەکانیدا هێمای بۆ ئەوە کرد کە: نۆرەی شانشینی عەرەبیی سعودی هاتووە و وەکو ڕژێمێکی سیاسی باوی نەماوە و کاتی ئەوەیە بڕوات!

بەڵام بەو جۆرەی کە هەمووان دەزانن، بۆ چەندین ساڵ دەچێت ئەبوسەرباز خۆی دونیای جێهێشتووە و ڕۆیشتووە و شانشینی عەرەبیی سعودیش لە شوێن و جێی خۆی ماوە!

## عەبدولڕەحمان

ساڵی١٩٧٩، فەرمانبەرێکمان بۆ هات بۆ ئیدارە محەلی بۆ بەشی ئەندازیاریی، واتە ئەو ژوورە کە منی لێ بووم، ناوی عەبدولڕەحمان بوو، خانەقینی بوو و پێشتر شۆفێری پاسی مەسڵەحە بوو. ئەم عەبدولڕەحمانە لە ناوەڕاستی ساڵانی حەفتا و لەپاش ئاشبەتاڵ زۆر گەرم بوو بوو و وا هاتە ئیدارە محەلی کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێت بە پارێزگاری سلێمانی! بەڵام عەبدولڕەحمان لەولاوە خەریکی چاوبڕکێ و مێبازی بوو لەگەڵ کچێک کە لە ژوورەکەماندا بوو. لەلایەکی

تر هەندێک لەو پێشمەرگانەی کە ورەیان تەواو ڕووخابوو و دەستیان لە هەموو شت شۆری بوو، لە نموونەی کەسانی وەکو حەمەڕەشید باوەمەردەیی و خەڵکی تری دەهێنا بۆ ئیدارە محەلی بۆ ژوورەکەمان و لەوێ دادەنیشتن خەریکی چپەچپ دەبوون، عەبدولڕەحمانیش هەر زانیاریی و دەنگ و باسێکی لەم کەسانەوە دەستبکەوتایە دەسبەجێ دەینارد بۆ ئەمنی سلێمانی.

ڕۆژێکیان حەبیب هەورامیی ناسراو بە حەبیبی عەبە هەورامی کە ماڵیان لای گردی سەیوان بوو لە سەر ڕێگای گردی شەهیدان و کە پێش تێکچوونی بەرەی نێوان بەعس و شیوعی پێکەوە شیوعی بووین و دواتر دەستی دایە کەسابەت و ئیشی تەعمیراتی دەکرد، هات بۆ لام بۆ فەرمانگە بۆ ئیش و کار، منیش ئەوکات هەموو ئیش و کارێکی کەشف و ئەو شتانە لە فەرمانگەی ئیدارە محەلی بوو لای من، یەک دوو کەشفم پیشاندا، کەچی چەند ڕۆژێکی نەبرد بانگیانکردم بۆ ئەمنی سەرکارێز!

ئەوکات ساڵح جافەرانی خاڵی عەلی چەلەبی لە ئەمنی سەرکارێز بوو، هات بۆ ئیدارە محەلی بۆ لام نووسراوێکی پێ بوو وتی: کاک عەلی، سبەینێ کاتژمێر هەشت وەرە بۆ ئەمنی سەرکارێز ئیشیان پێتە، بەڵام هەرچییەکیان پێ وتی بڵێ نازانم. منیش لە کاتی دیاریکراودا چووم بۆ ئەمن، ساڵح جافەرانی لەوێ ناردمییە لای معاون ئەمنێک ناوی عامر بوو و خۆیشی هاتە ژوورەوە. معاونەکە لێمی پرسی: تۆ ئیش بۆ حیزبی شیوعی دەکەیت؟ وتم: نەخێر ئیش بۆ هیچ کەس و لایەنێک ناکەم. وتی: وەرە لە سەر ئەو کاغەزە بنووسە و پەیمان بدە،

ئەگەر دەستگیرکرایت لە سەر پەیوەندیت بە حیزبی شیوعییەوە حکومەت لەسێدارەت دەدات، بۆیشمانی واژۆ بکە. منیش ئەوەم بۆ نووسی و واژۆم لە سەر کاغەزەکە کرد.

عامری معاون ئەمن پێی وتم: پێم بڵێ حەبیب هەورامی بۆچی دێت بۆ لای تۆ؟! کاتێک کە معاون ئەم پرسیارەی لێکردم لە دڵی خۆمدا وتم: ئێ ئێ، کەواتە ئەمە عەبدولڕەحمانی ژوورەکەی خۆمان لە ئیدارە محەلی ڕاپۆرتی لە سەر نووسیوم! بە معاونم وت: من حەبیب هەورامی ناناسم، لەو ژوورەی من کە بەشی هەندەسەیە کەشفی هەرچی پڕۆژەکانی تەعمیرات هەیە لای منە، ڕۆژانە دەیان خەڵک دێن داوای کەشف و تەعمیرات دەکەن، ئەمە هیچ پەیوەندیی بە سیاسەتەوە نییە. ئینجا معاون وتی بڕۆ لەو ژوورەی ئەودیو دابنیشە. قەدەرێک دەبوو بە تەنها لەو ژوورەی تەنیشت ژوورەکەی معاون عامر دانیشتبووم، کاتێکم زانی ساڵح جافەرانی هات بۆ لام و وتی: کاک عەلی بڕۆ خوات لەگەڵ، بەڵام وەک وتم: هەرچییەکیان لێ پرسیت بڵێ نازانم.

دواتر کاتێک لە مانگی دوانزەی ساڵی١٩٩١ لە زیندان ئازادبووم، بیستمەوە کە عەبدولڕەحمان لە پێش ڕاپەڕین بووە بە ئامر فەوج و برێک جرۆجانەوەری لە دەوری خۆی کۆکردووەتەوە، لەپاش ڕاپەڕین و نەمانی دام و دەزگاکانی حکومەتی بەعس لە سلێمانی هەڵهاتووە بۆ کەرکووک و لە کەرکووک وەک یاریدەدەری پارێزگاری سلێمانی ناوی کەوتبووە ناو ناوان.

## بۆ ئەوەی لە سەرما ڕەق نەبێتەوە

لە چایخانەکەی کاک ئەحمەدی چاپچی لە نزیک ئەسحابەسپی دانیشتبووین، نامیق مەلا سمایلی عەرزەوحاڵنووس باسی مەلا سمایلی باوکی بۆ کردین لە ساڵانی پەنجادا و وتی: بەرەبەیانی ڕۆژێکی سارد و کڕێوەی زستان، باوکم لە بازاڕەوە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، ڕەشەبایەکە زەلام دەبات، باوکم چەند جارێک لە دەرگای ماڵەوە دەدات، کەسمان ئاگامان لێ نییە و ناچین بەپیرییەوە و دەرگای لێ بکەینەوە، ئەویش ناچار دەڕوات، ملی ڕێگای بەرەو گۆڕستان دەگرێتە بەر. پاش ئەوەی لە خەو هەڵدەستین و دەبینین باوکمان نەهاتووەتەوە دەکەوینە سۆراخکردنی. زۆر گەڕاین نەماندۆزییەوە، ڕوانیمان لە گۆڕستانەکە و لە نزیک گۆڕەکەی شێخ مارفی نۆدێ کە گومەزەیەکی بە سەرەوە بوو دووکەڵ بەرەو ئاسمان بەرزدەبێتەوە!

لە دەوروبەری نۆی بەیانی باوکم گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، یەکپارچە بۆنی دووکەڵی گرتبوو! دایکم لێی پرسی: لە کوێ بوویت؟ باوکم وتی: لە قسنەکەی شێخ مارف بووم. دایکم وتی: چۆن لە سەرما ڕەق نەبوویتەوە؟! ئەی ئەو دووکەڵە چی بوو لە نزیک گۆڕەکەی شێخ مارف؟ باوکم وتی: ڕەق نەبوومەوە، ئەو دووکەڵەیش دووکەڵی ئەو ئاگرە بوو کە من کردبوومەوە، سێ فەردە قورئانی کۆن و پواو و هەڵوەشاو لە ناو قسنەکەی شێخ مارفدا بوو، لە بەرەوە ئاگرم پێوە نان و خۆم لە بەر ئاگر گەرم کردەوە، ئیتر بۆچی ڕەق دەبمەوە.

نامیق گێڕایەوە و وتی: باوکم زۆربەی کات چارەک و دوو چارەک ئارەقی پێ بوو و مەست و سەرخۆش بوو.

## نەخۆشخانەی سیلەکە

سەرەتای سالانی پەنجا، لە سەردەمی حکومەتی مەلیکە بچکۆل، واتە مەلیک فەیسەڵی دووەم، بۆ پڕۆژەکانی سلێمانی بڕیاردرابوو نەخۆشخانەیەکی گەورە بۆ نەخۆشیی سیل لە تووی مەلیک دروست بکرێت. بەڵێندەری پڕۆژەکە عەرەبێکی عەگال بە سەری سەر بە خێزانی هاشمی بوو.

دەستکرا بە ئیشکردن تیایدا و بەردی بناغە دانرا، بەڵام خەڵکانێکی ساختەچی و قۆڵبڕ لە وەستا و نەقارەکان، هەر بەردێکیان بە حەوت ئەوەندەی نرخە ڕاستەقینەکەی خۆی بە پڕۆژەکە دەفرۆشت، ئیتر ئیشەکە ڕاگیرا و بەڵێندەرەکە پڕۆژەکەی بە تەواونەکراوی جێهێشت.

## ناوی هەندێك لە شیوعیکوژان و هاوکارانیان

بەیادەوەریی من، واتە هێندەی ناوەکانم لە یاد ماوە، ئەمانە ناوی ژمارەیەک لە شیوعیکوژەکان و ئەو هاوکارانەیانن کە بە جۆرێک لە جۆران دەستیان هەبوو لەو قەسابخانەیەدا کە سالانی شەست لە شاری سلێمانی بە ناوی کانیی ماسی و کانیی ساردیی بۆ شیوعییەکان دانرابوو:

سالە سیک، قالەی کولەشین، حەمەی عەزەدۆم، حەمەڕەشید ئەحەشانە، کەریمی شێخ حەسەن چەخماخساز، حسەی فارس، مچەی مینا (مچەی باوەگەورە)، سالە پیر (ساڵحی قالەی حەلاو)، عەلی فەرەجە کوردە، جەمالی فەرەجە کوردە، عەبەی ئەولکەریم قەرەتۆغانی، عەلی عەینە، عەبەلالە، ئەمینی فارس، ئەنوەری حاجی قادر قەرەتۆغانی، سالەی جانە، عەبە جوجە،

ساڵح قرگەیی، عوسەی ئامە، سدیقی ئامەدرێژ، کامیلی شەفیق، ڕەئوف کانیی ساردی، کەریم کانیی ساردی، عومەری سالەی مەسور، عەلی عەبەی خوێ، سەڵاحی فاتە قەمبوور، فەرەجی نەریمان، عەبە نەقارِ قرگەیی.

جا ئەم شیوعیکوژانە کە چایخانەکەی کانیی ماسی (قەرەتۆغانی ئێستا)یان کردبوو بە بنکە و بارەگا بۆ خۆیان، شیوعییەکانیان لە سەر شەقامەکان و لە ماڵان دەستگیر دەکرد و دەیانڕفاندن بۆ کانیی ماسی و لەوێ ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆریان دەدان و پاشان دەیانکوشتن.

شایانی باسە ئەم پیاوکوژانە کە هەندێکیان سەر بە پارتی و هەندێکیشیان سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسی بوون، ژێر بە ژێر دەزگای ئەمن و هەواڵگریی ئەوکاتی سەردەمی عەبدولسەلام عارف سەرپەرشتیی و هاوکاریی دەکردن و بە فەرمانی عەگید سدیق، کە نوێنەری مستەفا بارزانی بوو لە شاری سلێمانی، دەجووڵانەوە و کارە تیرۆریستییەکانیان ئەنجام دەدا.

لەدواییدا کە دەستەکەی ئاشکرا بوو، عەگید سدیق لە سلێمانی دوورخرایەوە و لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە و لە ساڵی١٩٦٩دا کرا بە یەکەمین پارێزگاری شاری دهۆک پاش ئەوەی کە لەو ساڵەدا دهۆک لە قەزاوە کرا بە شار و بە پارێزگا. هەروەها باس لەوەیش دەکرا کە زوربەی ئەم شیوعیکوژانە لەلایەن دەزگای ئەمن و هەواڵگریی ئەو سەردەمەی ڕژێمی عێراقەوە جگە لەوەی کە دەمانچەیان پێدراوە، مانگانەی پانزە دیناریشیان بۆ بڕدراوەتەوە.

## سی شەو بەر لە دەستگیرکردنم

دەتوانم بڵێم دواجار کە بانگکرام بۆ ئەمنی سلێمانی و ئەوکات بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی سلێمانی چوو بووە باڵەخانە تازەکە کە ئێستا بە ئەمنەسوورەکە ناسراوە، ڕۆژی ١ی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٨٩ بوو.

ڕۆژی پێشتر پێیان ڕاگەیاندم کە سبەینێ کاتژمێر شەشی ئێوارە سەردانی ئەمن بکەم. بۆ سبەینێ لە کاتی خۆیدا چووم. دنیا زۆر سارد بوو، ئاسمان هەور بوو و پڕوشەی دەکرد، ئێمە ئەوانەی کە بانگکرابووین هەشت نۆ کەسێک بووین هەمووومان لە کارگێڕیی خۆجێی فەرمانبەر بووین. چووینە پرسگەکە، کابرای پرسگە لە ناو ئەو ژوورە درێژکۆلە و گەورەیەی پرسگەکەدا لە تاو سەرما خەریکبوو دەچووە ناو عەلادینەکەوە! کابرا دەسبەجێ بە بازرگانمان تێگەیشت و وای زانی بۆ داوای مۆڵەت بۆ کاری بازرگانی هاتووین بۆ ئەمن چونکە کاتێک کە چووین لە پرسگەکە لە لای سەرەوە دانیشتین، پرسیاری کرد: بۆ مۆڵەتی بریکارنامە وەرگرتن هاتوون؟ وتم: بریا بۆ ئەوە بهاتینایە! نەهاتووین، بەڵکو بانگکراوین. ئیتر کابرا پرسیاری نەکردەوە. لەدوای ئەوە هەریەکەمان ناوی خۆمان لە ناو دەفتەری تۆماری پرسگەکەدا نووسی و ئەویش بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ بەشەکانی ژوورەوە کرد و وتی: ئەم ناوانە لە سەر داوای خۆتان هاتوون و ئێستا دەیاننێرمە ژوورەوە.

هەریەکەمان چووین بۆ بەشێک، من چووم بۆ بەشی ژمارە (٧٨) کە ئەحمەد دوری لێپرسراوی بوو و ئەو بەشە بوو کە تایبەت بوو بە شیوعییەکان، بەڵام ڕێکەوت نە ئەحمەد دوری و نە کەسی

تر لەوێ بوو. بە ئیشی تایبەت ڕۆیشتبوون. هەستم بە شادی کرد. خوا خوای ئەوەم بوو زوو بێمە دەرەوە و جێیبهێڵم. هەر کات کە چووبم بۆ ئەمن هەستێکی سەیر دایگرتوم. هەستم دەکرد بەپێی خۆم دەچمە ناو گەرداوێکە کە ئیتر ناتوانم لێی بێمە دەر. هەر بۆیە لە هاتنە دەرەوەدا پێم هەڵگرت و زوو هاتمەوە دەرەوە.

ئەمجارە لە بەر دەرگا کوڕەکانی عەلی خەلیفە جافەرانیم بینی پاسەوان بوون. یەکێک لە کوڕەکانی ناوی حەمەساڵح بوو. عەلی خەلیفە خۆی بە ڕۆژ لە ئەمن دەوامی دەکرد. چونکە پێشتر لە گەڕەکی خەبات هاوسێ بووین، عەلی و کوڕەکانیشیم دەناسی. کەمێک لەگەڵ حەمەساڵح لە بەر دەرگا لەو بەر سەرمایە ڕاوەستام. لێی پرسیم: کاک عەلی خێرە هاتوویت بۆ ئێرە؟ وتم: ئەحمەد دوری بانگیکردبووم، بەڵام لەوێ نەبوو، وتیان بە ئیشی تایبەت ڕۆیشتووە. پاشان گەڕامەوە بۆ ماڵەوە.

کاتێک کە لە شەوی ٣٠ لە سەر ٣١ مانگی ئایاری ساڵی ١٩٨٩ لە ماڵەکەی خۆمدا لە گەڕەکی ڕزگاری لەلایەن ئەمنی سلێمانییەوە دەستگیرکرام، ئینجا بۆم دەرکەوت کە لە سەرەتای مانگی ئایارەوە بە وردی چاودێرییم خراوەتە سەر.

## ئەی تاوانی گەنجە کراس سوورەکە چی بوو؟

ساڵح عەرەب، هەوادار و لایەنگرێکی خوێنگەرم و چالاکی حیزبی شیوعی بوو لە سلێمانی، ڕۆژێکیان لە گەڕەکی مەڵکەندی لەلایەن کانیسارد‌ییەکانەوە پەلاماردرا و تیرۆرکرا.

ئەوەی لەم ڕووداوی تیرۆرەدا جێی سەرسوڕمان بوو ئەوە نەبوو کە ئەندامێکی حیزبی شیوعی تیرۆرکرا، کە تیرۆرکردنیان

لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا بوو بووە باو، بەڵکو ئەوە بوو کە لە کاتی پەلامارە تیرۆریستییەکەدا بە ڕێکەوت گەنجێکی کراس سوور لە نزیک ڕووداوەکە بوو، تیرۆریستەکان، تەنها لە بەر کراسە سوورەکەی بەری، چاویان لێی نەپۆشی و دەستیان لێی نەپاراست و لەگەڵ تیرۆری ساڵح عەرەبدا ئەویشیان تیرۆرکرد.

پێموایە ئەم گەنجە کراس سوورە برای شێخ کەمال بوو، کە لە سەر شەقامی مەولەوی لە ڕیزی کتێبخانەی گەلاوێژی ڕەئوف مەعروف، سەعاتچی بوو.

باشە وا وتمان ساڵح عەرەب شیوعی بوو بۆیە تیرۆرکرا، ئەی تاوانی ئەو گەنجە سوورکراسە چی بوو؟!

## ئەو هەڕەشەیەی کە لە پای خوێنبەخشینەکە لێمان کرا

لەو هەرا و زەنایەی ساڵانی شەست و بەدواوەدا، ڕۆژێکیان لە شەقامی ئۆرزدی، بە مەبەستی تیرۆرکردن و کوشتن، تەقە لە حەمەئەمین پێجوێنی کرا و ناوبراو لە ڕووداوەکەدا بریندار بوو. ئەوکات من لە مەسلەحەی نەقلی ڕیکاب کارمەند بووم، جا هەم وەکو ئەرکی هاوڕێیەتی و هەم وەکو ئەرکێکی حیزبیی، بەپەلە لەگەڵ حسێن نەسروڵلادا چووین بۆ نەخۆشخانەی سەرەوە بۆ سەردانی، تەماشامانکرد برینەکەی مەترسیدار نییە بەڵام پێویستی بە خوێن هەیە، هەربۆیە خوێنمان پێبەخشی. ئەوەبوو دواجار خۆشبەختانە حەمەئەمین پێنجوێنی زامەکەی سارێژ بوو و هەستایەوە و نەمرد، بەڵام لەپاش بەینێک و لەپای ئەم خوێنبەخشینە هەڕەشەی کوشتن لە من و حسێن نەسروڵلا کرا، وەک ئەوەی خوێنمان بە کەسێکی زۆر تاوانبار بەخشی بێت!

## کێ مامۆستا (سەلاح)ی بەکوشت دا؟

مامۆستا سەلاح، کە بە سەلاحی کفتە ناسراو بوو، ئەندامێکی چوست و چالاکی حیزب بوو لە شیوی قازی لە قەرەداغ لەگەڵ مام بارام و شێخ ڕەسوڵ و ئیسماعیل نەسروڵلا لەو ناوچەیەدا سەرکردایەتی حیزبیان دەکرد. بەر لە شالاوەکانی ئەنفال نێردرایەوە بۆ سلێمانی، بەلام لای کانیی سپیکە و هەر لە بەری ئەوبەری تانجەرۆوە، بوو بە داوی ڕژێمەوە و بێسەر و شوێن کرا و تا ئێستایش سۆراخی نییە و کەس نازانێت چی بە سەر هێنرا.

باشە کێ مامۆستا سەلاحی ناردەوە ناو شار و بۆچی لەو بارودۆخە خراپەدا ناردییەوە، کە قوش لەو خاڵی پشکنینانەی پیاوانی ڕژێم دەربازی نەدەبوو؟!

من کە تاقیکردنەوەیەکی زۆرم لەگەڵ فێڵ و تەڵەکە و قۆڵبڕین و پاشقولگرتن و تەفرەدان لە ماوەی ژیانی حیزبایەتیدا هەیە، پێموایە کە مامۆستا سەلاح بەکوشتدرا. بەلام ئەوەی کە کێ بەکوشتیدا و بۆچی ئەو کارەی کرد؟! ئەمەیان بابەتێکە کە من نایزانم، بەڵکو ئەمە خوایە لە داهاتوودا ئەو نهێنییەمان بۆ ئاشکرابێت، هەرچەندە من لەوبارەیەوە نائومیدم چونکە زۆر نهێنی وەک ئەم نهێنییە هەر بە نهێنی چوونە ناو مێژووەوە و ڕازیان بۆ کەس ئاشکرا نەبوو.

## گرنگترین ڕووداوی ساڵی ١٩٦٧ لە عێراق

بە بڕوای من، گرنگترین ڕووداوی سیاسی لە ساڵی١٩٦٧و لە عێراقدا، کەرتکردنەی حیزبی شیوعی عێراق بوو لەلایەن عەزیز حاج-ەوە، کە ناوبراو بە ڕەچەڵەک کوردی فەیلی بوو و لە ناو حیزبدا ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو.

ئەوکات باس لەوە دەکرا کە عەزیز حاج لە چیکۆسلۆفاکیاوە گەڕاوەتەوە بۆ عێراق بە نیازی ئەوەی دەست بە سەر حیزبدا بگرێت و خۆی ببێت بە سکرتێری حیزب. هەڵبەتە ئەو لەم نیازەیدا سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام توانی یەکپارچەیی و یەکڕیزیی حیزبەکە تێکبدات و لە ناو ببات. خۆ هیچ دوور نییە کە ئەمەیان، واتە تێکدانی یەکڕیزیی حیزب و لاوازکردنی ڕۆڵ و پێگەی لە ڕێگای دووکەرتکردنییەوە، مەرام و نیازی سەرەکیی عەزیز حاج بووبێت.

دوابەدوای ئەم جیابوونەوەیە هێندەی نەبرد هەم ڕژێمی ئەوکاتی عێراق و هەم ناحەزانی حیزب گەلەکۆمەیان لە حیزبی دایک و لە کەرتەکەی عەزیز حاج-یش کرد و کردیان بە ئاردی بەڕوو کە بە پەینکەی خۆیشی نەشێت! ئا لەم کاتەیشدا ململانێی هاوڕێکان بۆ دەستگرتن بە سەر حیزبدا سەریهەڵدا، بە جۆرێک ئەو هاوڕێیانەی کە تا دوێنێ لە ڕیزەکانی یەک حیزبدا کار و چالاکییان دەکرد، بە چەشنێک بوون بە دوژمنی یەکدی کە بە خوێنی سەری یەکدی تینوو بوون. چەندین هاوڕێی دوێنێ لەوانەی کە ئەو ڕۆژە لەگەڵ کەرتکارییەی عەزیز حاج-دا ڕۆیشتن، لەلایەن حیزبی دایکەوە بە جۆرێک بە فەرامۆشیی سپێرران کە تا ئەمڕۆیش نەک هەر ڕێز و ئیعتیباری پێویستیان بۆ نەگەڕێنراوەتەوە، بەڵکو لە کولەکەی تەڕیشدا باسیان ناکرێت و ناویان نابرێت. چەندین شیوعی هەڵکەوتووی وەکو ئەحمەد مەحمودی دەلاک و ساڵح عەسکەری، فایەق دەرەویانی، لەلایەن ڕژێمەوە بە درندانەترین شێوە لە ژێر ئەشکەنجەدا تیرۆرکران. بەڵام تیرۆری شیوعیی دیاری وەکو جەلالی ڕابیعە-یش لەلایەن

کەرتەکەی عەزیز حاجەوە، دیسان هەر جێی داخ و مایەی سەرزەنشت بوو.

دەربارەی کەرتکارییەکە هەر ئەوکات ئەوە بە ئێمە وترا کە ئەم کەرتکارییە بە هاندان و پاڵپشتیی حەبیب محەمەد کەریم-ی سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان بووە بۆ عەزیز حاج. ئەوەندەی ئاگاداریشم تێکڕای ڕێکخراوەکانی حیزبی شیوعی لەو کاتەدا، تەنها چەند کەسێکی کەمی لێ بترازێت، کە بە پەنجەی دەست دەژمێردران، هەموویان لەگەڵ کەرتەکەی عەزیز حاج ڕۆیشتن.

سالّح عەسکەری، بەر لە دەستگیرکردنی لەلایەن ڕژێمەوە، لێپرسراوی حیزب بوو لە سلێمانی، لە یەکەم دانیشتنی دوای کەرتکارییەکە، دەرکەوت کە پێنجسەد ئەندام و پاڵێوراو لە ڕێکخراوەکانی حیزب لە سلێمانی لەگەڵ عەزیز حاج هاتوون، ئەوانەیان کە زۆر دیار و بەرچاو بوون، ئەم ناوانە بوون: حسێن عارف-ی پارێزەر، حەمە سدیق-ی پارێزەر، حەمە مستەفا-ی پارێزەر، شێخ عەلی نائیب زابت، فاروق مەلا مستەفا، عیزەت ڕەشید نەجیب، عەلی باراوی، شێخ حامید بەرزنجی لە کارگەی جگەرە، موسڵیح مستەفا جەلالی، عەلی کەریم (عەلی سوور، کە شۆفێری تایبەتی عەزیز حاج بوو)، شێخ سەعید بەرزنجی، عەلی حامید، مەلا عەزیز نەقاڕ، مامۆستا ئەحمەد میرزا، حەمەی نانەوا (حەمە فیشەک شڕ)، حەمەی مەکتەبە، ئیسماعیل حاجی سەعید حەڵواچی، سەعید ئەحمەد جافەرانی (سەعە سوور)، فایەق ئەمین دەرەویانی، تەها خەلیل، مامۆستا عومەر-ی برای ئیسماعیل.

ئەو ناوانە هەموویان سەرپەرشتیی ئەو ڕێکخراوەیان کرد کە لە حیزبی شیوعی جیابووەوە و کۆنفرانسێک سازکرا لە ماڵی مامۆستا عومەر-ی برای ئیسماعیلی دووکاندار مەڵکەندی لەگەڵ هەردوو برینپێچ (موزەمید)ەکەی کارگەی چیمەنتۆ: عومەر بەلیس و عومەر سەعید، هەروەها لەگەڵ عەبدوڵڵا زەنگەنە، حەمەئەمین پێنجوێنی، مەحموودی ئەرزەوحاڵنووس کە ماڵیان لە ئیسکان بوو و ناسراو بوو بە خولە تەزویر.

ئەوەندەی من ئاگادارم یەک کەس لەو دۆخە، دۆخی جیابوونەوەیە، قایل نەبوو و دەستی لە حیزبایەتی هەڵگرت، ناوی عەبدولڕەحمان بوو و کانێسکانی بوو و دووکانی عەتاریی هەبوو لە قەیسەریی نەقیب.

هێندەی نەبرد لە یەکەم کۆبوونەوە یاخود یەکەم کۆنفرانسی ئەم دەستە جیابووەوە لە حیزبی شیوعی کە لە ماڵی مامۆستا عومەر لە ئەوپەڕی شەقامی گۆران یاخود ئۆرزدی سازکرا، محەلیی سلێمانی هەڵبژێردرا، ئەو کەسانەی کە خۆیان بەربژێر کردبوو بریتیبوون لە ئەمانە: عەلەڕەش دەربەندیخانی، حەمەفەرەج کانیبی دەربەندیخانی، مستەفا چاوڕەش.

لە کۆبوونەوەکەدا هەموو دەنگماندا بەم سێ کەسە، لەو سۆنگەیەوە کە ئەم سێ کەسە هەم ئازا و هەمیش سەربازیین. هاوکات چەند کەسێکی تریش، کە ناویان بە شاراوە مایەوە، وەک ئەنسار و هێزی چەک هەڵبژێردران.

پاش ئەوەی ئیش و کارەکان و ڕێکخراوەکان ڕێکخران، یەکەمین بەیاننامەمان لە بەغداوە لەلایەن عەزیز حاج-ەوە بۆ هات. بەیاننامەکە لە سەر لاپەڕەی بچووکی ڕەنگاوڕەنگ

چاپ کرابوو. من خۆم هەر لە هەوەڵەوە شۆخیم بە دۆخەکە دەهات، ئیتر کاتێک کە ئەم بەیاننامە رەنگاورەنگەیشم بینی زیاتر یەکلابوومەوە وتم: ئەمە بەیاننامەی حیزبە یان کاغەزی کۆلارەیە!؟

زۆری نەبرد ئەم رێکخراوە یاخود ئەم کەرتە حیزبە کە لە حیزبی شیوعی جیابووەوە، بوو بە دوو کەرتەوە. کەرتێکیان موسڵیح مستەفا جەلالی بوو بە خاوەنی، کەرتەکەی تریان شێخ عەلی نائیب زابت، کە ئەم کەسانەیشی لەگەڵ بوو: فاروق-ی مەلا مستەفا، حەمە سدیقی پارێزەر، حەمە مستەفای پارێزەر، شێخ حامید لە کارگەی جگەرە، عەلی حامید، مەلا عەزیز نەقارِ، عەلی باراوی، ئەحمەد میرزا. لەدواییدا عەلی حامید و حەمە ئەمین پێنجوێنی و سەعە سوور جافەرانی و فایەق دەرەویانی چووینە لای دەستەکەی موسڵیح مستەفا کە ماوەیەک هاتە سلێمانی و لەگەڵ دەستەکەی شێخ عەلی یەکترییان بە بەکرێگیراو و پیاوی حکومەت تاوانبار دەکرد.

موسڵیح مستەفا ماڵی خولە تەزویری لە سلێمانی و لە گەڕەکی ئیسکان کردبوو بە بنکە بۆ خۆی. لەدواییدا لە گەرمەی ئاڵۆزیی و بارگرژیی ئەو سەردەم و رۆژگارەدا کە لە هەموو عێراق و بەتایبەتی لە سلێمانییشدا هەبوو، هەردوو دەستەکە شاری سلێمانییان جێهێشت. دەستەکەی موسڵیح چووە دەرەویان لە قەرەداغ و دەستەکەی شێخ عەلی-یش چووە ناوچەی پردێ لە پارێزگای هەولێر. رۆژ لەدوای رۆژیش خەڵکی زیاتر و زیاتر لە هەردوو دەستەکە دووردەکەوتنەوە. ساڵی یەکەم تا رادەیەک باش بووین و دەورمان قەرەباڵغ بوو، چونکە بە خەڵکیمان

دەوت کە ماوەیەکی تر لە سەرانسەری عێراقدا شۆڕش بەرپا دەکەین! ئێمە، من و فایەق دەرەویانی و سەعە سوور لە سەر نەخشەی عێراق لە دارخورماکانی باشوورەوە بۆ داربەڕوو و دارگوێز و دارستانەکانی کوردستان و لای خالید زامداری وێنەکێش و جواننووس وێنەیەکمان کێشابوو لە بن هەموو دارخورما و داربەڕوو و دارگوێزێکدا وێنەی دوو پێشمەرگەمان دروستکردبوو و وێنەکەمان بڵاوکردبووەوە، وەک پێشتریش وتم ڕۆژانەیش خەڵکیی ڕیزەکانمانی جێدەهێشت.

ئەوانەی کە لەگەڵ باڵەکەی موسڵیح مابووینەوە چەند کەسێکی سەرسەخت و قیرسچمە بووین لە نموونەی: سەعە سوور جافەرانی و فایەق دەرەویانی و عەلی حامید، کە بڕێک ئەندام و هەواداری حیزبمان لەلا بوو و حیزب کابرایەکی خەڵکی هەولێری کردبوو بە لێپرسراومان وەک لێپرسراوی سلێمانی، ناوی سامی بوو، دەیانوت گوایە فەرمانبەرە لە شارەوانیی هەولێر. لەدواییدا خانوویەکی بچکۆلانەمان بۆ فایەق دەرەویانی بە ماڵەوە گرت بۆ ئیش و کاری حیزب و چاوپێکەوتن لەگەڵ هاوڕێ سامی.

من لەبەرئەوەی کە برای ئەحمەد حامید بووم و ئەحمەدی برایشم هەر لە هەوەڵەوە لەگەڵ کەرتبوونەکەدا نەهات و لە حیزبی دایکدا مایەوە، هەموو هاوڕێکانم لە باڵەکەی موسڵیح لێم بە گومان بوون. دەیانوت عەلی حامید ژێر بە ژێر لەگەڵ حیزبە سۆشیال دیموکراتەکەی بەهادین نورییە. هەڵبەتە ئەمە تۆمەتێک زیاتر نەبوو کە دەدرایە پاڵم. بەڵام من چونکە ڕەخنەم لە حیزب دەگرت و توانج و تەشەرم لێ دەدا، بۆیە بەوە تۆمەتبار دەکرام.

جارێکیان لە کۆبوونەوەیەکی شاردا لەوماڵەدا کە لە سەروو و ڕۆژهەڵاتی ماڵی حەمەی ئەورەحمان ئاغاوە بوو لای حەمامی بەرخی، ئێمە کە ئەندامانی محەلیی بووین پێش ئەوەی هاوڕێ سامی بێت بۆ کۆبوونەوەکە بە سەعە سوور و فایەقم وت بۆچی ئەم سامییە تاقیی نەکەینەوە تاکو توانا و لێهاتوویی سەرکردایەتییەکەیمان بۆ دەربکەوێت؟! بەڵام سەعە سوور و فایەق پێیان باش و خۆش نەبوو. بەڵام من وتم ئێوە ئارەزووی خۆتانە، من نامەیەک دەنووسم بۆ مەکتەبی محەلی و تێکەڵ بەو نامانەی تری دەکەم کە بە دەستمان گەیشتون و دەیخەمە بەر دەستی هاوڕێ سامی، با بزانم کاتێک کە چاوی بە نامەکە دەکەوێت و دەیخوێنێتەوە هەڵوێستی چی دەبێت؟!

ئیتر من، عەلی حامید، نامەیەکم بە دەستخەتی خۆم و بەو شێوەیەی کە لە خوارەوە نووسیومەتەوە بۆ هاوڕێ سامی لێپرسراوی محەلیی سلێمانی نووسی:

(إلى قادة الحزب و الثورة

أيها الرفاق الأعزاء قادة الطبقة العاملة والفلاحين

نحن فی حاجة ماسة إلى ساج ماسۆڵە، لأنه فی منطقتنا لاتوجد تەنور وليست لدينا محروقات ولاتوجد عندنا من المحروقات غير تەپاڵە والترسەقول والپشقل.

أيها الرفاق الأعزاء، أرجو منكم وبأقصى سرعة ممكنة، إرسال ساج ماسۆڵە إلينا.

مع تحياتي الحارة لقيادة الحزب والثورة.

توقيع: گێل و گەوجی مدينتكم).

پاش ئەوەی کە دەستکرا بە خوێندنەوەی نامەکان، منیش ئەم نامەیە، کە لوولم کردبوو و بە پارچەیەک پەتی فەرشە دڕاوەکەی ژێرمان بەستبووم، خستبوومە ناو نامەکانەوە، سەرە هاتە سەر خوێندنەوەی نامەکەی من، هاوڕێ سامی نامەکەمی کردەوە و یەک دوو جارێک بەبێ دەنگیی و بۆ خۆیی خوێندەوە، ئینجا لچی هەڵقورچاند و ناوچەوانی گرژ کرد و وتی: ئەم نامەیە هیچ ناونیشانێکی لە سەر نییە! منیش وتم: قەیچێکە هاوڕێ گیان، با بمێنێت بەڵکو ناونیشانی بۆ پەیدا ببێت. لەدواییدا نامەکەم لای سەعەسوور و فایەق جێهێشت و ئەمە دواکۆبوونەوەی من بوو لەگەڵیان.

پاش ماوەیەک زانیم کە موسڵیح و هەموو ئەو دام و دەزگایەی کە لە موسڵیحەوە نزیکبوون چوون لە دەرەویان لە قەرەداغ هەڵیاندابوو. منیش ڕێکخراوی شارم لەلا بوو، لەو کاتەدا حەمە ئەمین پێنجوێنی لای موسڵیح شکاتی لێکردبووم، وتبووی: عەلی حامید ئەو ئابوونەیەی حیزب کە لەلایەتی خۆی مامەڵەی پێوە دەکات و نایینێرێت بۆ حیزب! ئەوە بوو داوایان لێکردم کە کە بچم بۆ دەرەویان. منیش چاوەڕێی هەلومەرج و دەرفەتێکم دەکرد کە ڕێکبکەوێت و بچم بۆ دەرەویان. لەو کاتەیشدا باس لەوە دەکرا کە موسڵیح حەزی لە پیاوکوشتنە. هەروەها ئەو کاتە بنکەی حیزب بۆ هاتنی پۆستە و بەرید لە سلێمانی ماڵی مامۆستا ئەحمەد میرزا بوو لە سەروو ئۆرزدییەوە.

ڕۆژێکیان لە دووکانی مەحموودی دەلاک لە شەقامی کاوە دانیشتبووم، غەفووری میرزا کەریم و قادری برای بە بەر دووکانەکەدا ڕەتبوون، دیاربوو کە بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشتن،

کاتێک کە منیان بینی لە دووکانەکە دانیشتبووم بانگیانکردم کە بچمە دەرەوە بۆ لایان چونکە ئیشیان پێمە. منیش لە دووکانەکە هاتمە دەرەوە و چووم بۆ لایان. غەفوور وتی: بەریدتان بۆ هاتووە لە بەغداوە، لە ماڵی ئەحمەد میرزایە، بچۆ وەریبگرە. جا بەگوێرەی دابەشکردنی کاروبارە حیزبییەکان وا بوو، دەبوو من بچوومایە بەریدەکەم وەربگرتایە، بەڵام کاتێک کە چووم بەریدم وەرگرت، تەماشا دەکەم تەنها من ماوم کە بیخوێنمەوە، هەر هەموویان، واتە: غەفووری میرزا کەریم، ئەحمەد میرزا، حەمە ئەمین پێنجوێنی، عەلی بارۆیی، حەمەسدیقی پارێزەر، حسێن عارفی پارێزەر، بەر لە من خوێندویانەتەوە! ئافرەتێکیش بەریدەکەی هێنابوو لەو کاتەدا لە ماڵی ئەحمەد میرزا دانیشتبوو و حەمە ئەمین پێنجوێنییش لەلایەوە دانیشتبوو. لەپاش ئەوە بەریدەکەیان دا بە من کە بیبەم بۆ دەرەویان بۆ موسڵیح.

ئەوسا و ئێستایش نەمزانی بەریدە هاتووەکە چی تێدا بوو و بە تەنها هەر من مابووم بیخوێنمەوە! ئەو ئافرەتە کە بەریدەکەی هێنابوو عەرەب بوو و لەدواییدا هاوسەرگیریی لەگەڵ حەمە ئەمین پێنجوێنیدا کرد. ئیتر منیش خۆم کۆکردەوە و بۆ ڕۆژی دواتر چووم بۆ دەرەویان بۆ قەرەداغ. بەر لە چوونیشم سەرەتا چووم بۆ بازاڕ بۆ لای سمایلی حاجی سەعیدی حەڵواچی لە ئەسحابەسپی و پێم وت: دەچم بۆ دەرەویان بۆ لای موسڵیح، هەندێک حەڵوا و گەزۆم بدەرێ با لەگەڵ دەستی خۆمدا بۆی ببەم، سمایلی حاجی سەعید زۆری پێ باش و خۆش بوو و شیرینییەکەی بۆ پێچامەوە و لەگەڵ بەریدەکەدا لەگەڵ خۆمدا بردم.

لەو کاتەدا پشووی هەفتانەم هەبوو، ئەو پشووەم وەک دەرفەتێک قۆستەوە و ئەم گەشتی کارە حیزبییەم تێدا ئەنجامدا. هەموو ئەو پارەیەی ڕێکخراوی سلێمانیی حیزب کە لەو کاتەدا لەلای من بوو و لەلام کۆبووبووەوە، ٣٦ دینار بوو، جا لەو کاتەدا جەلال سەعید-ی ناسراو بە جەلالی ڕابیعە، کە فەرمانبەر بوو لە کارگەی جگەرە، لە ڕێکخراوی گەڕەکی خەبات بوو، لە کاتێکدا کە جەلال دەستگیرکرابوو، دوو دینارم وەک هاوکاریی بۆ ماڵ و منداڵەکانی دابوو بە خێزانەکەی. واتە ئەو پارەیەی حیزب کە لام مابووەوە تەنها ٣٤ دینار بوو.

بە پیکابێک کە لە ڕێگای قەرەداغ ئیشی دەکرد، چووم بۆ جافەران، شەو لە جافەران لە ماڵی سەعە سوور جافەرانی مامەوە، کاتەکەی چونکە هاوین بوو لە باخەکەی سەعە سوور و لە بن کەپرێک ڕۆژمان کردەوە. بۆ سبەینێکەی لەگەڵ سەعە سوور پێکەوە بە پێ لە جافەرانەوە چووین بۆ دەرەویان و بە دەم ڕێگایشەوە وردە وردە قسە و وتوێژمان دەکرد، کاتێک کە گەیشتینە پەرژینی باخی دەرەویان لە پاڵ پەرژینەکەدا کۆپانێکی درێژ دانرابوو، بە سەعە سوورم وت: هەبێت و نەبێت ئەم کۆپانە کۆپانی بارگیرەکەی حیزبە! سەعە سوور وتی: دەمی خۆت بگرە، خۆت بە کوشت دەدەیت ئەو قسانە دەکەیت! ماوەیەکی تر بەرەو ژوور ڕێمانکرد تەماشامکرد بارگیرێک لەو بەر خۆرەتاوە و بەبێ کاو جۆ و ئالیک بە پەرژینەکەوە بەستراوەتەوە و بارگیر بە کلکی مەگەز و مێش لە خۆی دووردەخاتەوە، منیش وتم: ئەها کاک حەمە سەعید، پێم نەوتیت؟ ئەوەیش بارگیرەکەی حیزب! سەعە سوور تەماشایەکی کردم و بزەیەکی کرد و هیچی نەوت. ماوەیەکی تر

بە پێ ڕۆیشتین تا گەیشتینە مزگەوتەکەی دەرەویان کە لەو کاتەدا بوو بوو بە بارەگای حیزب و موسڵیح لەوێ دادەنیشت.

کە چوومە مزگەوتەکە لە حەوشەی مزگەوتەکەدا بڕێک خەڵکی سلێمانیم بینی. یەک دوانێک لەو خەڵکە ڕادیۆیەکیان بە دەستیانەوە گرتبوو، کاتێک کە بە سەرنجەوە لێیان وردبوومەوە دۆخەکەم وەک ئاشبەتاڵ دەهاتە پێشچاو. هەواڵم زانی کە هاوڕێیان دوو تەنەکە ئاردیان ناردووە بۆ ماڵێک تاوەکو بۆیان بکەن بە نان! ڕادیۆ بۆریان خستووەتە سەر ئێستگەی (تیرانا)ی ئەلبانیا کە بە زمانی عەرەبی پەخشی هەبوو و بێژەری ڕادیۆکە ئەوەی کە بە ئەمەریکای دەڵێت نایڵێتەوە و هەمان قسەیشی بە سۆڤیەت دەوت.

بۆ نانی نیوەڕۆ نان و دۆیان خوارد، نانەکەیش بەشی نەدەکردن. پێموتن کە من دەتوانم لێرە لە حەوشەی مزگەوتەکەدا کوورەیەکتان بۆ دروستبکەم بۆ خۆتان نانی پێ دروست بکەن، ئیتر بۆچی ئارد دەنێرن بۆ ماڵان بۆتان بکات بە نان؟! وتیان: نامانەوێت، چونکە لێرە نامێنینەوە و دەڕۆین. کات بوو بە ئێوارە، تەماشامکرد حەمە ئەمین پێنجوێنییش هاتووە بۆ ئەوێ. بۆ نانی ئێوارە ئەم کەسانە داوەتی ماڵی فایەق دەرەویانی کرابوون: موسڵیح مستەفا جەلالی، ئیبراهیم عەللاوی، حەمە ئەمین پێنجوێنی، سەعە سوور جافەرانی، کاک فایەق کە ماڵەکەیان بنکە و بارەگای موسڵیح بوو، هەروەها فایەق دەرەویانی خۆیشی لە ماڵەوە بوو، بەڵام منیان بانگ نەکرد.

بۆ شەوەکەی ئێمە ئەم چەند کەسە لە سەربانی مزگەوتەکە خەوتین و ڕۆژمان کردەوە: ئیبراهیم عەللاوی، عەلی حامید،

حەمە ئەمین پێنجوێنی، موسڵیح مستەفا، فایەق دەرەویانی، سەعە سوور جافەرانی.

لە بیرمە شەو بەر لە نووستنمان باس و خواسی ئەوە هاتە پێشەوە کە حیزبی بەعس بۆ ئەوە نەهاتووەتە دەسەڵات تاکو خزمەتی خەڵکی عێراق بکات، هەر بۆیە ماوەیەک نەرمی و نیانیی دەنوێنێت بەڵام لەدواییدا بە ئاگر و ئاسن مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا دەکات.

ئیبراهیم عەللاوی پێمی وت: تۆ بە ڕەنگ و ڕوو لە خەڵکی یەمەن دەچیت! ئەو حەڵوا و گەزۆ و بەریدەی کە لە سلێمانییەوە لەگەڵ خۆم هێنابووم لەگەڵ پارەی ئابوونەکە کە سی و چوار دینار بوو، هەموویم دا بە موسڵیح. وتیان بۆ سبەینێ کۆبوونەوەیەک دەکەین، چونکە موسڵیح لە تۆ ڕازیی نییە.

بۆ سبەینێ پاش ئەوەی کە نان و ئاو خورا، ئێمە ئەم چەند کەسە چووینە شەخسەکەی دەرەویان و کۆبووینەوە: عەلی حامید، حەمە ئەمین پێنجوێنی، فایەق دەرەویانی، سەعە سوور، موسڵیح. بڕوا بفەرموون خۆیشم نازانم ئەو شتە چی بوو کە باسمان کرد! موسڵیح وتی: ڕۆژی یەکی مانگی پێنجی ئەمساڵ، واتە ساڵی١٩٦٩، لە قەرەداغەوە دەچین بەرەو باقوبە و شۆڕشەکەمان دەست پێ دەکەین. لەدوای لێبوونەوە لە کۆبوونەوە و ئەو قسانە، وتم: من دەگەڕێمەوە بۆ سلێمانی، وتیان ئەم پیاوەیش لەگەڵ خۆت ببەرەوە، تەماشا دەکەم پیاوەکە سامییە، کابرای هەولێری، کە لێپرسراوی سلێمانیی حیزبە شیوعییەکەی موسڵیحە.

هەڵبەتە لەگەڵ سامی پێکەوە دوو بە دوو بە پێ گەڕاینەوە بۆ سلێمانی. لە دەرەویانەوە بۆ کانی ڕۆشنایی و دارۆغا و پاشان بەرەو پردی تانجەرۆ و لەوێشەوە بۆ گەڕەکی خەبات. تا گەیشتینە گەڕەکی خەبات ڕۆژ ئاوا بووبوو. لەو کاتەیشدا جەلالییەکان پاراستنی ئارامیی و ئاسایشی شاریان پێ سپێررابوو و مەفرەزەکانیان بەردەوام بە دەوری گەڕەکی خەباتدا دەسووڕانەوە، هەر بۆیە کاتێک کە گەیشتینە گەڕەک بە ڕێکەوت تووشمان بوو بە تووشی مەفرەزەیەکەوە کە لەم کەسانە پێکهاتبوو: عەبدوڵڵا حەسەن-ی ناسراو بە عەبەی ئایشێ، عەلی خەبات ڕەباتی، فەتاح کە بە پیاوەکەی حەمەی شێخ عەبدولکەریم ناسراو بوو. خوا هەڵناگرێت ئەو سێ کەسە هیچیان پێ نەوتین و دەستیان نەهێنایە ڕێگامان، چونکە هەم من ئەوانم زۆر باش دەناسی و هەم ئەوانیش منیان زۆر باش دەناسی.

پاشان گەڕاینەوە بۆماڵی خۆمان کە بەرانبەر بە ماڵی عوسمانی ڕەشە جووتەی عەرەبانچی بوو کە کرێچی خاوەنماڵێکی خەراجیانی بوو بە مانگانەی پێنج دینار. پاش ئەوەی کە لە ماڵەوە پشووماندا و حەساینەوە، کاتێکم زانی تەق تەق لە دەرگای ماڵمان درا. چووم بە پیرەوە تەماشا دەکەم عەبەی ئایشێ و عەلی خەبات و فەتاح هەرسێکیانن هاتوون بۆ ماڵەوە بۆ لام. وتیان کاک عەلی ئێمە تۆ دەناسین و بە حیزبمان وتووە، بەڵام ئەو پیاوە ناناسین کە لەگەڵتە، لەبەرئەوە دەیبەین لەگەڵ خۆمان بۆ لای حیزب. ئەگەرچی من پێموتن ئەو پیاوە خۆمانەیە و پێویست ناکات بیبەن لەگەڵ خۆتان میوانی

منه، بەڵام کەڵکی نەبوو و سامییان لەگەڵ خۆیان برد چونکە وەک خۆیان وتیان حیزبەکەیان داوای لێ کردون لەگەڵ خۆیاندا بیهێنن، منیش سامی هەرچی بڵاوکراوە و شتێک کە پێی بوو پێشتر لێم وەرگرتبوو و کردبووم بە ژێر گوێسوانەی دیواری حەوشەکەدا.

لەدوای بردنی سامی، دەستەوسان دانەنیشتم، بەڵکو بە تەلەفۆن پەیوەندیم بە عەلی باراوییەوە کرد، ئەویش بە تەلەفۆن حەمە مستەفای پارێزەری ئاگادارکرد. دەوترا حەمە مستەفا وەک کەسێکی یاساناس، بریکاری ئیش و کاری حاجی برایمی چەرمەگایە و ئەوان دەتوانن لەگەڵ جەلالییەکاندا قسە بکەن و سامی بەرەڵا بکەن.

لەدوای بردنی سامی و هەواڵدان بە عەلی باراوی، گومانم کرد و وتم دوور نییە نەختێکی تر جەلالییەکان دیسان بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی منیش لەگەڵ خۆیاندا ببەن، هەر بۆیە بەماڵەوەم وت من دەڕۆم بۆ ماڵی عوسمانی کاکی قەرەتۆغانی، کە ماڵەکەیان لە ڕیزی ماڵی مەلا ساڵح بوو لە خوارەوە. ڕۆژم لە ماڵی عوسمان کردەوە. بۆ سبەینێ کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، ماڵەوەمان وتی لەدوای ڕۆیشتنی تۆ دەستەیەک چەکداری تری جەلالییەکان هاتن بۆ ماڵەوە بۆ بردنی تۆ، دەستەکە مامۆستا شێخ بەهادین لێپرسراویان بووە و کاتێک کە زانیویەتی لە ماڵەوە نیت زۆر توڕە بووە و وتویەتی: کوا عەلی حامید چووە بۆ کوێ؟! شەڕ لە شەڕگادا خۆشە، ئەو نامە و بڵاوکراوە و بەریدەی کە هێناونی چی لێ کردون؟

ئەوەبوو جەلالییەکان بۆ ڕۆژی دواتر و هەر بەیانی زوو سامییان ئازادکرد، بەڵام من ئیتر چاوم بە چاوی سامی نەکەوتەوە.

## سووتاندنی دوو پاسی مەسڵەحە

مانگی نۆی ساڵی ١٩٦٦ بوو، جابی بووم لە هێڵی گواستنەوەی ناو شار یاخود مەسڵەحەی نەقڵی ڕیکاب، ئەوکاتە مەسڵەحە ڕۆژانە پاسێکی دەچوو بۆ بەکرەجۆ و دوو پاسیشی دەچوون بۆ سەرچنار. هەموو چوون و هاتنەوەیەکیشیان بە وادە بوو، واتە کاتی دیاریکراوی خۆی هەبوو. بارودۆخە سیاسییەکەی ئەوێ ڕۆژێ لەچاو خۆیدا تا ڕادەیەک ئارام بوو. دەبوو پاسەکەی بەکرەجۆ لەکاتژمێر پێنچ دەربچوایەو کاتژمێر شەشی ئێوارە بگەڕایەتەوە، هەمانشتیش سەبارەت بە دوو پاسەکەی سەرچنار.

ئەگەرچی، بەداخەوە، کتومت بەرواری ڕۆژەکەم لە یاد نەماوە، بەڵام دڵنیام لەوەی کە کات مانگی ئەیلول بوو، دووریش نییە کە، وەک تۆمار، ئەم ڕووداوە لەبنکەی پۆلیسی سەرچنار تۆمارکرابێت و هەبێت. دوو پاسەکەی سەرچنار و بەکرەجۆ لەلای دووڕیانی سەرچنار بەیەکدی گەیشتن و بەرەو شار گەڕانەوە. کات ڕووەو ڕۆژئاوابوون بوو.

عەلی حامید، خاوەنی ئەم بیرەوەرییە، لەگەڵ پاسەکەی سەرچنار بوو، جابی بوو لەگەڵ ئەو پاسەدا کە سەلاحی عەلی بەگی عەرەبانچی شۆفێری بوو. هەرچی جابی پاسەکەی بەکرەجۆیە ناوی شێخ ساڵح شاربازێڕیی بوو، پیاوێکی

بەساڵاچوو بوو. شۆفێری پاسەکەیش ناوی سابیر سەعید بوو، خەڵکی سلێمانی بوو.

لەدوای ماوەیەک گەیشتینە ئەو شوێنەی ئێستای بەرانبەر بە بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی ڕۆژئاوای سلێمانی. ئەوکات ئەو شوێنە سەرتاپا شینکە و کەوەلی و کانەبەرد بوو، بە کانە بەردەکانی کەڵەکە مەڕ ناسراو بوو. کە گەیشتین سەر ڕێگاکەمان لێ گیرا بوو. هەر لە دوورەوە دەستی ئاماژەیان بۆ وەستانمان بەرزکردەوە. کۆمەڵێک چەکدار لەو جێیەدا ڕاوەستابوون. ئیتر هەردو پاسەکە بە شوێن یەکتردا لەو شوێنەدا ڕاوەستان.

چەکدارەکان داوایان لێ کردین هەموو لە پاسەکان دابەزین، ئێمەش هەموومان، کە بریتی بووین لە دوو شۆفێر و دوو جابی و دوو سەرنشین، لە پاس دابەزین. یەکێک لە سەرنشینەکان ناوی تۆفیق بوو، خزمی حاجی ئەحمەدی بەلوعە و ئاو بوو کە لە شەقامی مەولەوی لە ڕیزی ئەحمەدی سەعاتچی دووکانی هەبوو. سەرنشینی دووەم کە لە پاسەکەی بەکرەجۆدا بوو کاتێک کە پرسیاری لێ کرا لە وەڵامدا دەرکەوت کە قوتابییە و خەڵکی هەولێرە. چەکدارەکان توڕە بوون و ڕەفتاریان لەگەڵمان توند بوو، گەرچی ئێمە ناسیمانن کێن. پەلێک پێشمەرگە بوون حەمەی سەید عەلی کارێزەیی سەرپەلیان بوو. سالە سوور یەکێک لە پێشمەرگەکانیان بوو کە وەختی خۆی شۆفێری مەسڵەحە بوو و هەڵاتبوو. ئەم ساڵحە ناوی تەواوی ساڵح محێدین بوو، هەروەها بە سالەی محەی دەشتەکە دەناسرا. ماڵیان لە ئەسحابەسپی و لە نزیک مزگەوتی دوو دەرگا بوو. پێشمەرگەکەی تر مستەفا حەمە ئەمین سام سام بوو، ئەویش لەوەوبەر شۆفێری پەروەردە بوو و هەڵاتبوو، برای عومەری حەمە

ئەمین سام سام بوو، لەلایەک عەریفی ئەمن بوو و لەلایەکی تر جەلالی بوو. کاک عومەر لەسەر ڕێگای سلێمانی کانی با، لەگەڵ کوڕێکی خەراجیانی، کەوتنە بۆسەیەکی پارتییەوە و تیاچوون. پێشمەرگەکانی دیکە لە ئەمبەرو ئەوبەری شەقامەکە خۆیان پەنا دابوو بۆ ڕووبەڕوبوونەوەی هەر ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو. لەم کەین و بەینەدا سەڵاحی عەلی بەگ داوای لە پێشمەرگەکان کرد، پاسەکان بسووتێنن! ئەوانیش پاش چەند خولەکێک پاسەکانیان بە شێوەیەکی ڕاست و چەپ لەسەرشەقامەکە ڕاگرت.

لەم کاتەدا و کتوپڕ ئۆتۆمبیلێکی جۆری تایبەت لە سەرچنارەوە بەرەو لای ئێمە هات. ئۆتۆمبێلەکە گەیشتە ئاستی پاسەکان و ڕاوەستا، هەر خێرا پێشمەرگەکان دەورویان لێ گرت. دەرکەوت کە ئۆتۆمبێلەکە تەنها سەرنشینێکی تێدابوو ئەویش شۆفێرەکەی بوو، ئیتر دایانبەزاندو لەگەڵ خۆیان بردیانە لای کانە بەردەکان. دواتر وەک باسیانکرد ئەو کەسە بەڕێوەبەری هێزی پۆلیسی گەڕۆک بوو کە بارەگاکەی لای سەهۆڵەکە بوو. پاش بەینێک پێشمەرگەکان لە ئۆتۆمبێلە تایبەتەکە بڕێک بانزینیان دەرکرد بۆ پرژاندنی بەسەر پاسەکان و ئۆتۆمبێلە تایبەتەکەدا بەمەبەستی سووتاندنیان.

لەو کاتەدا ئەو ناوچەیە چۆڵەوانی بوو. پاش ئەوەی ئاگر بەردرایە ئۆتۆمبێلەکان و ئۆتۆمبێلەکان گڕیانگرت و دووکەڵ بەرزبوویەوە بۆ ئاسمان، تانکێک کە لە ناو دەرکی کارەباکەدا ڕاوەستابوو و دیاربوو کە ئاگرو دووکەڵەکەی بەدیکردبوو، دەستیکرد بە تەقەکردن، بەم جۆرە حکومەت دەرکی کرد کە شتێک قەوماوە. ئیتر ڕێگای هاتوچۆ لە سەر ئەو هێڵە و

بەتایبەتی بـەرەو سـەرچنار گیرا. ئێمەیش لە کاتی تەقەکاندا بەمەبەستی پاراستنی گیانمان لەناو کانە بەردەکان خۆمان مات کرد، هەرچەندە تەقەکان بە ئاراستەی ئێمە نەبوون. پاشان پێشمەرگەکان هاتن بۆ لای ئێمە و دوو نەفەرەکە و وتیان بتانبەین لەگەڵ خۆمان؟! ئێمەیش وتمان ئەگەر شۆڕش پێویستی پێمانە: بەڵێ. یەکە یەکە پرسیاریان لێکردین سەر بە چ حیزبێکن. ئێمەیش وتمان بە ئەوەندە سوێند و قورئان سەر بە هیچ لایەنێک نین. دواتر جانتای جابێتییەکەیان لە من و شێخ ساڵح سەند. سالە سوور جانتاکەی منی لە پشتی خۆی بەست، مستەفایش ئەوەی شێخ ساڵحی لە پشت کرد. لە ناو جانتاکەی مندا شەش دینار و چەند بەستە بلیتێک هەبوو کۆی هەموویان گەر بکرانایەتە پارە، لەگەڵ پارەی ناو جانتاکەدا، بیست دینار دەبوو. ئەوەی ناو جانتاکەی شێخ ساڵحیش بڕی چوار دینار و نیو بوو.

کاتێکمان بە خۆ زانی وەخت کەوتە درەنگ و تاریک دا هات، پێیانوتین ئێوە نابەین. بەڵام ئەوانی تریان دایە پێش خۆیان و بردیانن. تا ئەو دەمە حکومەت زاتی ئەوەی نەکرد توخنی ناوچەکە بکەوێت. ئێمەیش بـەرەو سـەرچنار بە ڕێ کەوتین. سەلاحی عەلی بەگ لە هەموومان وریاتر بوو چونکە وتی با لە گوێ ڕێگاکەوە بڕۆین، جگە لەوە قۆڵی کراسەکانمانی دڕاندو قۆپچەکانی لێکردینەوەو چنگێک خۆڵی کرد بە سەر و چاو و باڵای هەریەکەماندا.

بە بەر ڕووناکیی گڵۆپی ستوونی کارەباکاندا گەیشتینە سەرچنار و نزیک ناوماڵەکان بووینەوە. خەڵکی کە چاویان پێمانکەوت هاتن بەرەو پیرمان. هەر زوو ناسییانینەوە کە جابی

و شۆفێری مەسڵەحەین. پرسییان چی قەوماوە، پێشمەرگە پاسەکانیان سووتاند؟!

بەهۆی گرتنی ڕێیەکەوە خەڵکی سەرچنار نەیانتوانی بگەڕێنەوە بۆ سەرچنار. پاشان چووین بۆ بنکەی پۆلیسی سەرچنار. ئێمە و پۆلیسەکان یەکترمان دەناسی. دیاربوو کە پۆلیسی سلێمانی پۆلیسی سەرچناریان ئاگادارکردبوو کە وریای خۆتان بن. لە بنکەکە وەک ڕاگرتن بردیانینە ژوورێک و لەوێ هێشتیانینەوە. لەپاش ماوەیەک هاتن پرسیاریان لێ کردین، ئێمەیش ڕووداوەکەمان بۆ گێڕانەوە. لێیانپرسین بکەرەکان کێ بوون، نەتانناسین، جلی چییان لەبەردابوو، چ جۆرە چەکێکیان پێ بوو؟! ئێمەیش وتمان بە ئەوەندە سوێند و قورئان لەبەرئەوەی کە زۆر شڵەژابووین و کاتیش درەنگ و شوێنەکەیش تاریک بوو، هیچمان نەبینی تا بۆتانی بگێڕینەوە. ئینجا وتیان ئەی نەتانزانی بەرەو کوێ هەڵهاتن؟ بە نەخێر وەڵامی ئەمەیشمان دایەوە.

ئەو شەوە لە بنکەی پۆلیسی سەرچنارماینەوە. پۆلیسەکان نەیاندەوێرا قسەمان لەگەڵ بکەن، بەڵام بە ڕووخساریاندا دیاربوو کە زۆریان پێ خۆش بوو پێشمەرگە ئەو چالاکییەی ئەنجامدا. بۆ سبەینێ کاتژمێر دە هێزێکی زۆری سەر بە ئاسایش و پۆلیس لەگەڵ بەڕێوەبەری پۆلیسی شار هاتن و لەگەڵ خۆیان بەرەو سلێمانییان بردین. بردیانینە سەر شوێنی ڕووداوەکە، ئەو شوێنەی کە ئێستا پێیدەڵێن خانووەکانی کارگەی جگەرە. بردیانینە سەر گردەکە، فەرموو بۆمانی بگێڕنەوە بکەران لە کوێوە هاتن و لە کوێوە هەڵهاتن؟ هێزێکی زۆری پۆلیس و ئاسایشیش لە سەر گردەکە بڵاوەیان پێ کرابوو.

لەپاش نزیکەی کاتژمێرێک بگرە و بەردە و هێنان و بردن و پرسیار و پشکنین، ئەوجا هەموو بەرەو سلێمانی گەڕاینەوە. ئێمە هەموو دەسبەجێ گەڕاینەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتیەکەمان کە لە سەروو فولکەی سجن بوو و پێشتر بەڕێوەبەرایەتی کارەبا بوو. لەوێش دیسان بەسەرهاتەکەمان بۆ کارگێڕییەکەمان گێڕایەوە، پاشان هەریەکە دوو ڕۆژ مۆڵەتیان بۆ کردین و گەڕاینەوە ناو ماڵ و منداڵ. دواتریش هیچ لێمان نەپرسرایەوە.

ئەوکات ماڵمان لە گەڕەکی خەبات بوو، بەرامبەر بە ماڵی عوسمانی ڕەشە جووتە، ماڵیان ئاوابێت دراوسێ و خزم و کەس بۆ هەواڵپرسین سەردانیان کردین، یەکێک لەو خزمانە کە هاتن، حەمە فەرەجی نەریمان بوو، کە زۆربەی کات لە ناو بازاڕ لە بەر خانەقا بوو، پاش ئەوەی بەگەرمیی بەخێری هێنامەوە، وتی: کاک عەلی لە کاتی ڕووداوەکەدا زەلامێکت بینی کە لە تاریکییەکەدا بوو؟، منیش وتم: نەوەڵا کەسم نەبینی، وتی: دە سا وەڵڵا ئەوە من بووم!

## ئەو ڕۆژەی کە ئاسۆی دەلاك لە کۆڵانەکەماندا دەستگیر کرا

ڕۆژێکی مانگی هاوینی ساڵی١٩٧٩ بوو، ماوەیەکی زۆر نەبوو ئەحمەدی برام، کە لەلایەن ئەمنەوە دەستگیرکرابوو، ئازادکرابوو، بۆ ئەو ڕۆژە ماڵی ئەحمەدم بە خاو و خێزانەوە داوەتی ماڵی خۆمان کردبوو لەو خانووە حکومییەی کارگێڕیی خۆجێیەتیی کە لە گەڕەکی گۆیژە چەند ساڵێک بوو تێیدا

نیشتەجێبووین. بانگهێشتمان کردبوون بۆ نانی نیوەڕۆ بێن بۆ ماڵی خۆمان. من کە ئەو ڕۆژە لە سەر کار و لە دەوام بووم لە کارگێڕیی خۆجێیی، دەوروبەری بەر لە نیوەڕۆ مۆڵەتم وەرگرت و لە فەرمانگە هاتمە دەرەوە و وردە وردە بە پێ و بە ناو بازاڕدا بەرەو شەقامی سابوونکەران هەڵگەڕام و وەک هەندێک لە ڕۆژانی تر بەو ڕاستە شەقامەی سابوونکەراندا ڕووەو ماڵەوە گەڕامەوە.

ئەوکات خانووەکانی کارگێڕیی خۆجێیی کە ژمارەیان دە خانوو بوو و لەوبەر شەقام و بەوبەر ناوەندیی ڕۆژهەڵاتی کوڕانی ئێستاوە لە ساڵی ١٩٥٤دا لەلایەنی ئەندازیار جەمیلە کەڕ دروست کرابوون، پێنج خانوویان ڕوویان لە سەر شەقامی خوار فولکەی گۆزەکان بەرەو خوار و پێنجیشیان بە دیوی مەخزەنی کۆلاکەی عەبەی کۆلا و ڕووەو سەیوان بوون، لە نێوان هەر دوو دانەیەکیشیاندا کۆڵانێک دروستکرابوو و بەم هۆیەیشەوە ژمارەی ئەو کۆڵانانەی کە لە نزیک ماڵەکەمانەوە بوو کاتێک کە لە بەری قوتابخانەی ئێستای ڕۆژهەڵاتەوە بۆ بەری خانووەکان لە شەقامەکە دەپەڕیتەوە تا دەگاتە خوار فەرمانگەی مەلاریاکە، چوار کۆڵان بوو، بەڵام من، تا ئەو کاتەی کە ئەو کۆڵانانە لە بەر پرسی ئەمنیی نەخرابوونە سەر خانووەکانی ئیدارە محەلی و دانەخرابوون و نەکرابوون بە حەوشە بۆ خانووەکان، هەموو جارێک لە کۆڵانەکەی ماڵی خۆمانەوە دەگەڕامەوە ماڵەوە و لەوێوە بەرەو دەرگای سەرەکی ماڵەوە کە لە سەر کۆڵانەکە و بەرانبەر بە مەخزەنی کۆلاکەی عەبە بوو، دەڕۆیشتم و دەچوومە ژوورەوە.

ئەو ڕۆژە کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، وەک ڕۆژەکانی تر ڕۆژێکی سادە و ئاسایی نەبوو، چونکە هەر کە لەگەڵ لەمبەر شەقامەکە بەرەو ئەوبەری شەقامەکە پەڕیمەوە و ئەو چەند هەنگاوەم هەڵنا کە دەمگەیەنێتە ناو کۆڵانەکەی خۆمان، هەم جموجوڵێکی نائاسایی و هەمیش کشوماتیی و بێدەنگییەکی نامۆ و سەیرم هەست پێ کرد کە لە ڕۆژانی پێشتر دیمەن و دۆخی لەو جۆرەم هەست پێ نەکردووە و نەبینیوە. خۆ ڕۆژانی تریش جموجوڵ و هاتوچۆ لە کۆڵانی ئێمە هەبووە و گەرم و گوڕیش بووە، بەڵام زیاتر جموجوڵی ئەو ئۆتۆمبێلی لۆری و بارهەڵگرانە بوون کە باری سندوقی کۆلا و هەندێکی تر لەو خواردنەوە گازییانەیان لە کەرکووک و بەغداوە دەهێنا بۆ مەخزەنەکەی عەبەی کۆلا، یاخود جموجوڵی ئەو پیکاب و ئۆتۆمبێلە بچووکانەی دیکە بوو کە دەهاتن لە مەخزەنەکە کۆلا و خواردنەوە گازییەکانی تریان بار دەکرد و بۆ کۆگا و فرۆشگا و دووکانەکانی ناو شاریان دەگواستەوە و لە سەر داوای خۆیان بە سەریاندا دابەشیان دەکردن.

ئەو ڕۆژە، کاتێک کە گەیشتمە کۆڵانەکە، لە بەرانبەرم و لە بەر دەم دەرگای مەخزەنی کۆلاکە، واتە لە کۆڵانەکەی تری ڕووی پێشەوە و بەر دەمی ماڵی خۆمان، لادایەکی ڕەنگ سپی ڕاوەستابوو و چەند کەسێک بە جلوبەرگی مەدەنییەوە، بەڵام چەک بە دەست بوون و چەکەکان بە دەستیانەوە دەبینرا، بە دەور و خولیدا دەهاتن و دەچوون و مقۆمقۆیان بوو و لەوەدا بوون وەک بڵێی لەو شوێن و ناوچە و کۆڵانانەدا دابمەزرێن و خۆیان بنێنەوە بۆ شتێک یاخود بۆ کەسێک.

هەڵبەتە ئەو خانووانەی کارگێڕیی خۆجێیی لەو کاتەدا بەو جۆرە دروستکرابوون کە هەر یەکێکیان دوو پەنجەرەی بۆ هاتنە ژوورەوەی ڕووناکیی بۆ ناو هۆڵی خانووەکە کە هۆڵێکی بەرین و گەورە بوو، لە سەر کۆڵانەکە بۆ دروستکرابوو، جا یەکێک لەو زەلامە نامۆیانە کە من وامدەزانی بەرەو ڕووی من دێت کە لە کۆڵانەکەوە دەگەڕامەوە بۆماڵەوە و جیاواز لە زەلامەکانی تر شەڕواڵ و کراسی لەبەردابوو بەڵام ڕەنگ و ڕووی لە کورد نەدەچوو، هاتە کۆڵانەکە و لە سەر گۆشەی ئەو خانووە جێگیر بوو کە ماڵی کاک جەلال سەعید هاوسەری گەلاوێژ خان، باوکی زمناکۆ و ئاکۆی تێدا نیشتەجێ بوو. منیش ئاسایی و بەبێ ئەوەی خۆم تێکبدەم و بشڵەژێم وردە وردە هەنگاوی خۆم نا تا گەیشتمە سەر گۆشەکەی ماڵی خۆمان و بە دەستی ڕاستدا سووڕام و چەند هەنگاوێکی ترم هەڵنا تا گەیشتمە بەر دەم دەرگای ماڵەوە و تەماشام کرد دەرگاکەمان دانەخرابوو بەڵکو پێوەدرابوو، پاڵم بە دەرگاوە نا و چوومە ژوورەوە. بەڵام بەر لەوەی کە بچمە ژوورەوە و هەر لە گۆشەکەوە کە بەرەو لای ڕاست بەرەو دەرگای ماڵەوە وەرگەڕام هەر بە تیلەی چاو سەرنجمدا بەوبەر ماڵمانەوە و لەبەر دەم ماڵی کاک قادری باوکی مەهدی و هادی و دلێر و هاوسەری نەعیمە خانەوە، ئۆتۆمبێلێکی تری بچووکی ڕەنگ سپی لە پێشی ئۆتۆمبێلە لادا سپییەکەی بەر دەم مەخزەنی کۆلاکە ڕاگیرابوو و چەند کەسێکیش کە ژمارەیان خۆی لە پێنج شەش کەس دەدا و بە عەرەبیی دەدوان لە بەر دەم ئۆتۆمبێلەکەدا مشتومڕیان بوو.

واتە ئەم زەلامە نامۆیانە، کە لە پیاوی حکومەت یاخود ئەمن

دەچوون و کە هاتبوونە کۆڵانەکەمانەوە، دوو ئۆتۆمبێلیان پێ بوو. لەدواییدا کە چوومە ماڵەوە و لە پەنجەرەی یەکێک لە ژووری نووستنەکانمانەوە کە ڕووی لە ماڵی کاک حسێن و کاک قادر و مەخزەنی کۆلاکە بوو، تەماشام کرد ئۆتۆمبێلەکە لە جۆری تۆیۆتا کراونە و زەلامەکانیش هەموو جل و بەرگی مەدەنیی کراس و پانتۆڵیان لەبەردابوو و هەموویشیان چەکدار بوون.

هەروەها لەگەڵ چوونە ژوورەوەمدا کش و ماتیی و کپیی و ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆرم بە سەر ڕووخساری ماڵ و منداڵ و میوانەکانمەوە بینی. هەر بۆیە یەک بەدوای یەکدا و بەبێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامی پرسیارێکم بکەم ئینجا پرسیارێکی تر بکەم، پرسیارم دەکرد، دەمپرسی: چییە؟ چی قەوماوە؟ بۆچی وا شڵەژاون؟ ئەو چەکدارانە کێن لە دەرەوە؟ ئیشیان بەم ناوە چییە؟ وتیان: نازانین، دەمێکە هاتوونەتە کۆڵانەکەوە و هەموو هاتوچۆیەکی ئۆتۆمبێل و تەنانەت ڕێبوارانیشیان بەم کۆڵانەدا قەدەغە کردووە، بەڵام پێدەچێت کە ئەمن بن و مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێت بەتەمای چین و بۆچی هاتوون! بەڵام من وەڵامەکانی ئەوان تینوێتیی زانینیان نەشکاندم، هەر بۆیە لەو چرکەساتەدا بیرم لەوە کردەوە کە بچمە دەرەوە بۆ لایان بەڵکو شتێکیان لێ هەڵبکرێنم و بزانم بۆچی و بۆ کێ دانیشتوون!

بیرم کردەوە چۆن و بە چ بیانوویەک بتوانم بچم بۆ لایان و بیاندوێنم. بیرۆکەیەک بروسکەئاسا بە مێشکمدا تێپەڕی، خێرا بە خێزانەکەمم وت ئادەی خێرا سوراحییەکم بۆ پڕ بکە لە ئاوی سارد و لەگەڵ پەرداخێکدا بمدەرێ با بە بیانووی ئاو

بۆ بردنەوە بچم بۆ لایان. هەرچەندە ماڵ و منداڵ و تەنانەت ئەحمەدی برایشم بیرۆکەکەمیان لا باش و پەسەند نەبوو و وتیان شتی وا مەکە و ئەوانە ئەمنن و دوور نییە تێتهەڵبدەن و بیشتگرن، بەڵام من پێم لە سەر بۆچوونی خۆم داگرت و گوێم بە قسەکانیان نەدا کە لە ڕوانگەی خەمخۆرییانەوە دەیانکرد و داوایان لێ دەکردم نەچمە دەرەوە بۆ لایان.

ڕاستییەکەی من شتێکی تر لە مێشک و لە خەیاڵمدا بوو، من پێم وا بوو کە ئەمانە بۆ ئەوە هاتوون تاوەکو ئەحمەدی برام دەستگیر بکەن کە کەمتر لە مانگێک بوو لە ئەمن بەر بوو بوو. لەبەرخۆمەوە دەموت و بیرم دەکردەوە باشە کێ هەواڵی لێداوین کە ئەم نیوەڕۆیە ئەحمەدی برام لە ماڵی ئێمە داوەتە، وا ئەمن کۆڵانەکەمانی تەنیوە؟!

مەراقی وەڵامی ئەو پرسیارە ئۆقرەی لەبەر بڕیبووم و ناچاریکردم سوڕاحی پڕ لە سەهۆڵاو و پەرداخم لە ماڵەوە هەڵگرت و چوومە دەرەوە بۆ لایان. لەپێشدا بەرەو لای ئۆتۆمبێلە کراوەنەکە ڕۆیشتم، هێشتا چەند هەنگاوێکم مابوو بگەمە لایان یەکێکیان کە وا دیار بوو ئەفسەر بوو، هەر لە دوورەوە دەستی نا بە ڕوومەوە و پێیوتم دەستتخۆش بێت تینوومان نییە و ئاو ناخۆینەوە. ئیتر ڕووم بەرەو کۆڵانەکەی تەنیشتمان وەرچەرخاند و بە هەمان شێوە چەند هەنگاوێکم مابوو بگەمە لای، هەر لە دوورەوە و بە ئاماژە و بە قسەکردن پێی وتم تینووم نییە مەیهێنە. لەم کاتەدا ئەمنەکانی بەر دەم ماڵی کاک قادر کە ئەفسەرەکەیش لەوێدا ڕاوەستابوو، هاواریان لێ کردم: بڕۆ ژوورەوە و دەرگای ماڵەکەیشت دابخە. ئیتر

کاتێک کە بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە و چوومە ژوورەوە، هەم دڵنیابوومەوە لەوەی کە ئەمانە ئەمنن و ئەو ئەفسەرە، کە هەڵبەتە بە قسەکردنیدا دیاربوو ئەفسەرە نەک بە جلوبەرگەکەیدا کە وەک زۆربەی هاوڕێ ئەمنەکانی تری جل و بەرگی مەدەنیی پۆشیبوو، مولازم موحسینە.

ڕاستە کە من پێشتر مولازم موحسینم نەبینیبوو، بەڵام بەگوێرەی ئەو چیرۆک و بەسەرهاتانەی کە لەو سەردەمەدا خەڵکیی لەبارەیەوە دەیانگێڕایەوە و وەسفی کەسێتییەکەیان دەکرد و ئەفسەری دیار و دەرکەوتووی زۆربەی ئەو چالاکیی و کار و کردەوانە بوو کە ئەمنی سلێمانی لەو سەردەمەدا ئەنجامی دەدان، زانیم کە ناوبراوە. هەروەها دڵنیایشبوومەوە لەوەی کە بۆ دەستگیرکردنی ئەحمەدی برام نەهاتوون. ئینجا کەوتمە بیرکردنەوە و خەیاڵ و مەراقی ئەوەی کە کەواتە مولازم موحسین و ئەم ئەمنانە بۆ دەستگیرکردنی کێ هاتوونەتە کۆڵانەکەمانەوە؟!

ڕاستە لەو کاتەدا خواردن و چێشت ئامادەبوو بوو بۆ دانان لە سەر سفرە و دەستپێکردن بە خواردنی نانی نیوەڕۆ، بەڵام ئەو بارە نائاساییە کە کۆڵان و گەڕەکەکەمانی پێدا تێپەڕ دەبوو و هەموومانی خستبووە ناو ترس و دڵەڕاوکێوە، برسێتیی و نانخواردنی لە بیر بردبووینەوە. پاش ئەوەی کە هیچ بیانوویەکم نەما بۆ مانەوە لە کۆڵان بە ناوی ئاوگێڕانەوە و لە سۆنگەی ئەوەوە کە بزانین لە دەرەوە چی دەگوزەرێت و مولازم موحسین بەتەمای چییە، نەک من هەر خۆم بە تەنها بەڵکو ماڵ و منداڵ و میوانەکانیشم و هەریەک بە جیا یاخود هەر

دەستەیەک بەجیا و لەبەر پەنجەرەی یەکێک لە ژوورەکانەوە، هەم ژووری نووستنەکەی بەرانبەر بە مەخزەنی کۆلاکە و هەم جووت پەنجەرەی سەر کۆڵانەکە کە لە بەری ئەوبەری سەر گۆشەکەی ماڵی کاک جەلال سەعیددا ئەو ئەمنە ڕاوەستابوو کە شەڕواڵ و کراسێکی لەبەردابوو، لە پەنجەرەکانەوە بەڵام لەودیو ئەو پەردە سپییە تەنکە هاوینەییە کە بە پەنجەرەکانمانەوە بوو، سەرەتاتکێمان بوو و تەماشای دەرەوەمان دەکرد تاکو بزانین ئێستا نا تاوێکی تر چی دەقەومێت و کێ دەبێت بەو داوەوە کە لەبەر دەم ماڵی ئێمە بۆی دانراوە!

جا لە پەنجەرەی لای ڕاستی هۆڵەکەوە دووکانی وردەواڵە فرۆشییەکەی کاک مەحموود کە لە سەر گۆشەکەی سەرەوەی ڕیزی مەخزەنی کۆلاکە بوو بەجوانیی دەبینرا و لەو کاتەدا کە ئەمنەکان لەوەدا بوون لە سەر گۆشە و کۆڵانەکانی ئەو گەڕەکە خۆیان دادەمەزراند و جێیان قایم دەکرد، دوو ئەمن کە ئەمانیش هەر دیسان بەرگی مەدەنییان پۆشیبوو، چوونە ناو دووکانەکەوە کە وادیاربوو بەر لە هاتنەوەی من لە فەرمانگە ئەمنەکان کاک مەحموودیان ئیزندابوو و دووکانەکەیان پێداخستبوو.

کاک مەحموودی دووکاندار لە بەر دەم دووکانەکەی خۆیدا و لە ژێر چەرداخی دووکانەکەیدا بە دۆڵاب و بە پلێتی ئاسن چواردەوری بەر دەم دووکانەکەی خۆی بە سندوق و دۆڵابی ئاسن دەورە دابوو، کاتێک کە دووکانی دەکردەوە کەل و پەلێکی زۆری لە پسکیت و کێک و شەربەت و وردەواڵەی تری ناو دووکانەکەی دەهێنا لەسەر ئەو مێزە ئاسنانە دایدەنان و دەیخستنەڕوو. جا ئەو دوو ئەمنە کە چوونە ناو دووکانەکەوە

لە پشت ئەو دۆلابانەوە خۆیان شاردەوە. ڕەنگە نزیکەی نیو کاتژمێرێک یان چەند خولەکێک کەمتری خایاندبێت تا ئەو کەسە هاتە کۆڵانەکەمانەوە کە مولازم موحسین بۆسەکەی بۆ نابووەوە و ئەمنەکان بۆی دانیشتبوون. هەڵبەتە تا ئەو کاتە، واتە بەر لەوەی کەسی مەبەست بێتە کۆڵان و بۆسەکەوە، کۆڵان و گەڕەکەکەمان دۆخێکی تر لە کش و ماتیی و خامۆشیی باڵی بەسەردا کێشایەوە، ئەوەبوو ئەمنەکان هەریەک لەو شوێن و جێیە کە مولازم موحسین بۆی دیاری کردبوون، جێگیر بوون، ئیتر لە جموجوڵ و هاتن و چوون و قسەکردن کەوتن، مولازم موحسین لەگەڵ پێموایە دووان یان سیان لە ئەمنەکانی هاوڕێی چوو بوونە ناو ئۆتۆمبێلە کراونەکەوە دانیشتبوون، دوو ئەمن چووبوونە دووکانەکەی کاک مەحموودەوە، ئەمنە شەڕواڵ و کراس لەبەرەکە لە کۆڵانەکەی ئێمە، کە بەوبەر پەنجەرەکانی هۆڵەکەمانەوە بەباشیی دەبینرا وەک مارمێلکە نووسابوو بە دیوارەکەوە و بە دەستی ڕاستی توند دەمانچەکەی گرتبوو.

ئەم ئەمنەی بەرانبەر پەنجەرەکەی ئێمە کە زۆربەمان سەرنجمان لە سەری بوو، لەبەر نزیکییەکەی لە مەودای بینینمانەوە بەئاشکرا هەستمان بە هەناسە و جووڵەی لەشی دەکرد، کە ئەوەندە شپرز و پەشۆکاو بوو وەک هەڵلەرزینی کەسێک لە تاو سەرما، بەئاشکرا هەڵدەلەرزی. وەک وتم لە پەنجەرەی لای ڕاستی هۆڵەکەمانەوە دووکانەکەی کاک مەحموودی وردەواڵە فرۆش بەباشی دەبینرا، لەم کاتەدا کە وەک پێشتریش وتم هاتوچۆ بە کۆڵانەکەدا قەدەغەکرابوو، کاتێکمان زانی لە سەر گۆشەکەی تەنیشت مەخزەنەکەی عەبەی

کۆلاوە، کوڕێکی گەنجی باریکەلە کە دەستێک جلوبەرگی کوردیی لەبەردابوو، لەگەڵ ژنێکی عەبا بەسەر و منداڵێکی بچکۆلانە کە تەمەنی هەر سێ چوار ساڵانێک دەبوو، دەرکەوتن و بە هەنگاوی برێک گورج و خێرا بەرەو خوار و بۆ ناو کۆڵانەکەی ئێمە سەرەوخوار بوونەوە.

لەڕاستییدا ئێمە، هەم خاو و خێزان و هەم میوانەکانیشمان، کەسمان نەمانزانی کە ئەم کوڕە گەنج و ژن و منداڵە کە دێنە کۆڵانەکەوە، ئەو نێچیرەن کە مولازم موحسین خۆی بۆیان ناوەتەوە. ئەو کاتەی کە گەنجەکە و ژنەکە و منداڵەکە لە سەر گۆشەکەی سەرەوەی کۆڵانەکەمانەوە دەرکەوتن، منداڵەکە دەستی ڕاستی لە دەستی چەپی دایکیدا بوو و کوڕە گەنجەکەیش لەلای ڕاستی ژنەکەوە ڕێی دەکرد. هەمووی هەر ئەو چەند هەنگاوە بوو تا گەیشتنە بەر دەم مەخزەنی کۆلاکە. هەر لەگەڵ گەیشتنە ئاستی ئەو شوێنە کە ئۆتۆمبێلە لاداکە ڕاگیرابوو، کاتێکمان زانی بە جارێک شەش بۆ حەوت ئەمن بە هات و هاوار و هێرشبردنەوە پەلاماری کوڕە گەنجەکەیان دا، هەڵبەتە ئەمنە شەڕواڵ و کراس لەبەرەکەی کۆڵانەکەیشمان یەکێک بوو لەو ئەمنانە، بەڵام تا مولازم موحسین و ئەو چەند ئەمنەی ناو ئۆتۆمبێلە کراونەکە پەلامار و هەڵمەتیان نەبرد، ئەمنەکەی کۆڵانەکەی بەرانبەر پەنجەرەی هۆڵەکەی ئێمە نەجووڵا کە دیاربوو بۆ ئەوە لەو کۆڵانەدا خۆی نابووەوە نەبا گەنجەکە بەرەو ئەو کۆڵانە بۆ سەر شەقامە گشتییەکە لە دەستیان هەڵبێت، بەڵام ئەم ئەمنە کە بێگومان عەرەب بوو و جلی کوردیی لەبەرکردبوو، لە پەلەپەلیی و ئەو پەشۆکاویی و شپرزەییەدا کە هەر لە هەوەڵی

دامەزران لە کۆڵانەکەدا لە ترساندا تووشی بوو بوو و بەئاشکرا پێوەی دیار بوو، دواجار لەو شوێنەی کە لە بۆسەکەدا بۆی دانرابوو کیفی دەمانچەکەی و شانەیەکی فیشەکی لێ بەجێما. هەروەها دوو ئەمنەکەی ناو دووکانەکەی کاک مەحموودیش دەم و دەست و بەهەمان جۆر بەهەڵەداوان گەیشتنە سەر گەنجەکە. وادیاربوو هەر لەو کۆڵانەی ماڵی خۆماندا و لە خوار ماڵی خۆمانەوە و لە کۆڵانەکەی نێوان ماڵی کاک عەبدولمەسیح، کە پیاوێکی کریستیان بوو و خۆی و سوعاد خانی خێزانی بە تەنیا لە یەکێک لەو خانووە حکومییانەدا دەژیان و مناڵیان نەبوو، لەگەڵ ماڵی کاک شێرکۆ، هەروەها لە تەنیشت ئەو کەلاوەیەوە کە کەوتبووە پشت فەرمانگەی مەلاریاکە و تەنیشتی ڕاستی ماڵی کاک شێرکۆ، چەندین ئەمنی دیکەیش لەوێدا لە بۆسەدا بوون، چونکە ژمارەی ئەو ئەمنانە کە لە کۆڵانەکانی خوارەوە بە هەڵەداوان گەیشتنە سەر گەنجەکە، تا دەهات زیادی دەکرد.

بەم چەشنە هەم ئێمە خۆمان وەک نیشتەجێی ئەو خانووە کە لە ساڵی ١٩٧٤ەوە هاتبووینە ناوی و هەم میوانەکانیشمان، لە نزیکەوە بینیمان چۆن ئەمنەکان بەرەو گەنجەکە هێرشیان برد و بە کلکە دەمانچە و مشتەکۆڵە و شەق تێیبەربوون و پەلیان بەست و خزاندیانە ناو لاداکەوە. پاش ئەوەی کە گەنجەکە دەستبەسەرکرا و خرایە لاداکەوە، کە هەمووی چەند خولەکێکی کەمی خایاند و گەنجەکە نەیتوانی دەست بکاتەوە چونکە بەجارێک هەشت نۆ ئەمن میلی دەمانچە و کلاشنیکۆفیان لێ هێنایەوە، ئەفسەرەکە بەبێ ئەوەی بۆ خولەکێک چییە ژن و مناڵەکە مەحتەل بکات، هەردووکیانی ئیزندا بڕۆن، ئەوانیش بە

پڕتاو و پەلەپڕوزێ و وەک ئەوەی کە پێی پەتییان بە سەر پشکۆوە بێت، بە بەر دەمماڵماندا بەرەو خوار بۆ پشت ئامادەیی سلێمانیی کچان تێیان تەقاند.

هــەروەهــا لــەم کــاتــەدا کـە ئـەمـنـەکـان گـەنـجـەکـەیـان دەستبەسەرکرد و چەند ئەمنێک لە هـەردو دیـوەوە لەگەڵ گەنجەکە چوونە ناو ئۆتۆمبێلەکەوە، ئەمنەکانی تر کە لە دەوری لاداکە کۆبووبوونەوە و پێشتر هەموو میلی دەمانچە و چەک و کلاشنیکۆفەکانیان هێنابووەوە، دەستیان کرد بە هەلهەلەکێشان و دەستی بە دەمانچەیان و لوولەی چەکەکانیان کردە ئاسمان و تەقەیەکی زۆریـان وەک دەربڕینی شادیی و خۆشیی بە سەرکەوتنی کارەکەیان تەقاند. ئینجا سواری دوو ئۆتۆمبێلە سپییە مەدەنییەکان بوون و بەخێراییەک ئۆتۆمبێلیان ئاژوت و لە کۆڵانەکە دوورکەوتنەوە تەپ و تۆزێکی وایان لەپاش خۆیان بەجێهێشت دەتوت هەواڵیان بۆ هاتووە کە ئێستا نا تاوێکی تر پێشمەرگە دێتە سەریان و گەنجە دیلەکەیان لە دەست ڕزگار دەکات.

ئێمە کە زۆربەمان بینەری ئەم ڕووداوە ناخۆشە بووین، نانی ئەو نیوەڕۆیەمان لێ بوو بە ژەهری مار. هەموو دۆش دامابووین و دەتوت لە بانێکی بەرزەوە بەردراوینەتە خوارەوە. (هەی ڕۆ هەی ڕۆی ژن و هات و هاواری خۆمان کە دەمانوت: تیاچوو، گرتیان، بردیان، ئەمە تومەز مولازم موحسین بۆ ئەم گەنجە دانیشتبوو! ئەی باشە چۆن و بۆچی لە ژن و مناڵەکەی نەپرسی و ئیزنیدان کە بڕۆن؟! تۆ بڵێی ئەو ژنە، کوڕە گەنجەکەی بە گرت نەدابێت؟! با، ئەو ژنە هێنایە ناو بۆسەکەوە، مەگەر بە

چاوی خۆتان نەتانبینی چۆن هەقیان نەبوو بەسەر خۆی و منداڵەکەیەوە و تەنها هەر پەلاماری گەنجەکەیاندا و بردیان؟! باشە ئەی ئەو گەنجە کێ بوو؟! ئاخۆ کێ بووبێت؟!) چەند کاتژمێرێکی کەم لەدوای ئەم ڕووداوە، هەواڵ و دەنگ و باس لە گەڕەک و کۆڵان وەک تەشەنەبوونەوەی ئاگر بە ناو پەلاش و پاوان و پووشی کۆتایی وەرزی هاویندا، بڵاوبووەوە کە کەمێک لەمەوبەر مولازم موحسین لە بۆسەیەکدا لە نزیک سابوونکەران ئاسۆی دەلاکی دەستگیرکرد!

ئەگەر ئەمە ئەو ڕۆژی حەشرە نەبێت کە باس دەکرێت، ئەی ئاخۆ دەبێ ڕۆژی حەشر چۆن و کەی بێت؟! ڕاستییەکەی تا ئەو کاتە ڕووداوی هاتنی سەرلەئێوارە و شەوانی پێشمەرگە بۆ ناو شار و پێکدادانیان لەگەڵ ئەمنەکان و چەکدارەکانی ڕژێم و تاق و تۆقی تا درەنگانێکی شەو لە بەشی ڕۆژهەڵاتی سلێمانی، نە بە گوێ و چاوی ئێمەی نیشتەجێی ئەو گەڕەک و ناوچەیە و نە بە کۆڵان و گەڕەکەکەیشمان نامۆ بوو، بەڵام تا ئەو ڕۆژە و لە ماوەی ئەزموونی سیاسیی نهێنیی خۆمدا ڕووداوی لەو جۆرەم نەبینیبوو. بەگرتدان و ڕادەستکردنێک بوو بە ڕۆژی ڕووناک، یان وەک دەڵێن بە نوێژی نیوەڕۆ و بکەرەکەیشی یاخود بەگرتدەرەکەیشی ژنێک بوو. بەڵام ئاخۆ ئەو ژنە کێ بوو تا ئەو ڕادەیە لە ئاسۆی دەلاکەوە نزیک بوو کە هاوڕێ و یاوەری بوو و ئاسۆ ئەو هەموو متمانەیە متمانەی پێ بوو و بەپێی خۆی لەگەڵیدا هاتە بەر دەم مولازم موحسین؟

پێدەچێت ئەو ژنە هاوڕێ و هەڤاڵی ئاسۆ بووبێت لە ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناو شاری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا، کە

ئەوکات ئەو حیزبە زیاتر بە کۆمەڵە، کۆمەڵەی ڕەنجدەران، ناودەبرا و چالاکیی و جموجوڵیان لە ناو شاردا هەم زۆر و هەم کاریگەر و هەمیش بەردەوام بوو.

## مەلا عەبدولکەریم گەرمیانی

سەرەتای ساڵی١٩٦٩ بوو، لەگەڵ حەمەباقی غەفور قەرەتۆغانی ژنبرام پێکەوە چووین بۆ دەرەویان بۆ سەردانی کەمال غەفوری ژنبرام کە لە لقی پێشمەرگەکانی خالید ڕەباتی پێشمەرگەی پارتی بوو. شەو لەوێ بە میوانیی ماینەوە و تا درەنگانێک قسە و باسمان گێڕایەوە و گفتوگۆمان کرد و هەواڵی ئەوەمان پێگەیاندن کە لە شار دەنگ بڵاوە کە ڕژێم لەگەڵ شۆڕش بەتەمای دانوستان و ڕێککەوتنە، ئەوانیش بەم هەواڵ و دەنگ و باسە زۆر خۆشحاڵ بوون.

لە یادمە لەوێ پێشمەرگەیەکی بارزانی لێ بوو ناوی خورشید بارزانی بوو، وەک یاریدەدەر یاخود جێگری خالید ڕەباتی بوو. بۆ سبەینێ کاتێک کە لای ئەوانمان جێهێشت و لە دەرەویانەوە گەڕاینەوە بەرەو کانیی ڕۆشنایی کە ماڵی خزمانی خۆمانی لێ بوو و ڕێکەوت وابوو کە مەولودیان کردبوو و خەڵکێکی زۆریان بانگهێشتکردبوو، ئێمەیش تێکەڵ بە خەڵکەکە بووین و بۆ نانی نیوەڕۆ لەوێ ماینەوە، پاش ئەوەی نان خورا و چا خورایەوە و بۆ پشوو پاڵماندایەوە، بە وردیی و بە سەرنجەوە دەستمکرد بە چاو گێڕان تاکو بزانم و ببینم ئاخۆ کەسێکی لێ نییە کە بیناسم، لە دوورەوە و لە ناو خەڵکەکەدا فایەق ئەمین دەرەویانیم بەدی کرد کە بەجۆرێک خۆی گۆڕی بوو دەتوت هاتووە بۆ سەر

شایی. لەدوای یەکتری ڕاموسین و ئەحواڵپرسین فایەق سەری قسەی دامەزراند و وتی: بەتەماین لە ڕۆژی یەکی مانگی پێنجی ساڵی١٩٦٩ لە قەرەداغەوە بە ڕێ بکەوین بۆ بەعقوبە و لەوێ ئەو شۆڕشەمان دەست پێ بکەین کە بەردی بناغەکەیمان داناوە. منیش بە دەم گوێگرتن لە فایەقەوە بە وردیی سەرنجی خەڵکەکەم دەدا، تەماشا دەکەم زەلامێک کە کەوا و سەڵتەی شارستانیی لەبەردابوو لە بانیژەی ماڵێک تیکەی دەگلاند و بە دەم ناخواردنەوە چنگی کرد بەو جگەرە کوردییەدا کە لە سەر سفرەکە لەبەر دەمیدا دانرابوو و جگەرەی ماشییەوە و پاشان لە پەیژەکەوە دابەزییە خوارەوە و چەند بانیژە و سەر سفرەکەیەکی تری بە هەمان تەرز کرد و جگەرەیەکی زۆری کۆکردەوە و ئاخنییە باخەڵەکانییەوە. دیمەنەکەم زۆر پێ سەیر بوو، لەبەرخۆمەوە دەموت ئەم کابرایە چەند جامبازە! هەست دەکەم لە شوێنێک بینیومە، لە کوێ؟ نازانم. لەدواییدا هاتەوە بیرم کە ئەم کابرایەم لای قالەسووری دارتاش لە شەقامی کاوە بینیوە. ناوەکەیشیم بیرکەوتەوە، ناوی مەلا عەبدولکەریم گەرمیانی بوو، چونکە بێکەس و بێماڵ بوو، هەر بەو جۆرە دەژیا، کار و کاسپی و مووچەیەکی نەبوو، بەڵام ئەوەی کە سەیر بوو ئەوە بوو کە خۆی وەک پیاوماقوڵ نیشان دەدا، بەو شێوەیەیش خۆی تێکەڵاوی بنەماڵە و خێزانە ناسراوەکانی گەرمیان و کەلار و کفری و تەنانەت کەرکووکیش کردبوو. دواجار بۆم ساغبۆوە کە ئەم پیاوە هەر وایە و بە نانەسکی و لە سەر سکی خەڵکی دەژی و قسەی قەڵەویش دەکات، جارێکیان لەبارەیەوە لە شێخ ڕەئوف کە خەڵکی قازانقایە و شۆفێری ئیسلاحی زەراعی بوو پرسیارم کرد، شێخ وتی: ئەوە خەڵکی لای خۆمانە.

## چالاکییەکی بێوێنە!

شەوێکی ئەنگوستەچاوی نیوەی شەوی ساڵێک لە ساڵانی شەست، لقی پێشمەرگەکانی خالید ڕەباتی سەر بە پارتی، کە بنکە و مۆڵگەیان ناوچەی قەرەداغ بوو، بۆ چالاکییەک هاتنە گەڕەکی خەبات، ئامانجی چالاکییەکەیان دەستگیرکردنی شیوعییەکان بوو، لەدوای گەڕانێکی زۆر لە بەشی لای خواروەوی گەڕەک، مەحموودی عەبەی خوێی سەوزەفرۆشیان دەستگیرکرد و لەگەڵ خۆیاندا ڕاپێچیان کرد بەرەو بەشی لای سەرەوەی گەڕەک و لەوێش لە نزیک فولکەکە، مەحموودی پاقلەیان دەستگیرکرد و پاشان لەگەڵ خۆیاندا هەردوکیان تا دەوروبەری گڵەزەردە بردن و لەوێ ئازادیانکردن! بێگومان من ڕێزی زۆرم هەیە هەم بۆ مەحموودی عەبەی خوێ و هەم بۆ مەحموودی پاقلەیش، بەڵام ئەگەر ئەم دوو مرۆڤە مەڕ بوونایە نەک مرۆڤ، گورگ بە گورگیی خۆی دەستی تێ نەدەچوو کە بیانبات!

ئەوانەی کە خەڵکی کۆنی گەڕەکی خەباتن و لە نزیکەوە ئەو دوو پیاوە دەناسن، شایەدیی ئەوە دەدەن کە ئەم دوو مەحموودە چەندە پیاوێکی بێوەی و بەسەزمان و فەقیری ماڵی خۆیان و کاسپ بوون، هەموو تاوانێکیان ئەوە بوو کە هەواداری حیزبی شیوعی بوون، بۆیە ئەو لقە لە پێشمەرگە، بەو شەوە تاریک و نوتەکە، ڕێگایەکی دوورودرێژیان بڕی تا گەیشتنە شار و لە شاریش دوو بێوەیترین پیاوی شاریان ڕفاند و دواتر ئازادیانکردن.

یەکێک لەم دوو مەحموودە کە مەحموودی پاقلە بوو، بە پیشە پاقلەفرۆش بوو و کۆشێک منالی بەو کارە سەربەرز و

ڕووسوورانەیەی بەخێو دەکرد، لە ساڵانی حەفتادا کە بەعس و شیوعی پێکەوە بەرەیان هەبوو و پارتییەکان بەم بەرەیە زۆر سەخڵەت و بێتاقەت و دەهریی بوو بوون، کاتێک کە بانگەواز یاخود هاوار و بانگی پاقلەفرۆشیی دەکرد، نەیدەوت: پاقلەی کوڵیو، یاخود: پاقلەی کوڵاو، بەڵکو پڕ بە گەرووی هاواری دەکرد: وەرە بۆ پاقلە، پاقلە بەجەبهەوە، وەرە با دەمت سوێر بکەم! مەبەستی لە جەبهە (بەرە) بوو، ئەو بەرەیەی کە بەعس و شیوعی لەو ڕۆژگارەدا پێکەوە هەیانبوو و وەک پێشتریش وتم پارتی پێی قەڵس و پەست بوو بوو، مەبەستی لە دەم سوێرکردنەکەیش زیاتر پارتییەکان بوو کە ئەو ڕۆژگارە ناحەزی بێڕکابەری حیزبی شیوعی بوون.

## پرسیارەکانی عەلی حەلاو

لە شەستەکاندا باڵی مەکتەبی سیاسی، کە ناسراوبوون بە جەلالییەکان، بە ئامادەبوونی زۆرێک لە کادرەکانی، یەکەم کۆنگرەی خۆی لە بەکرەجۆ گرێدا. یەکێک لەو کادرانە کە لە کۆنگرەکە ئامادەبوو ناوی عەلی حەلاو بوو و کاتبی مەعاریفی سلێمانی بوو. عەلی حەلاو کە هاوکات بە عەلی ئیسماعیل بانگ دەکرا، سێ برا بوون، عومەر و عوسمان و عەلی. عومەر و عوسمان هەردووکیان لە پۆستەی سلێمانی کارمەند بوون، ماڵی عەلی لەو کاتەدا بەرانبەر بە بازاڕی شەهلا بوو و لەدواییدا بەر شەقامی کاوە کەوت.

عەلی حەلاو لە کۆنگرەکە چەند پرسیارێک دەکات، دەڵێ: ئێمە ئەگەر حیزبێکی نەتەوەیین، ئەو وێنانەی مارکس و ئەنگڵس

و ماوزیتۆنگ چییە کە لە هۆڵەکەدا هەڵمانواسیون؟ بۆچی مام جەلال وێنەی ماوزیتۆنگی کردووە بە بەر ئێخەیەوە؟ بۆچی ڕۆژانە دەبینین و دەبیستین دەیان کەسی سەر بە پارتی دێنە لای ئێمە و دەیان کەسی سەر بە ئێمەیش دەچنە لای پارتی؟ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد وەڵامی عەلی دەداتەوە و دەڵێ: جا ئەوە کەی کێشەیە کە لای ئێمەوە بچنە لای پارتی و لای پارتییەوە بێنە لای ئێمە؟ ئێمە و پارتی قوتابیی یەک قوتابخانەین، گرنگ ئەوەیە کە هێزی سێیەم پەیدا نەبێت.

ئەو پرسیارانەی تریش کە عەلی کردنی لە کۆنگرە خۆمان خۆش، کۆنگرە و ڕێکخەرانی کۆنگرە وەڵامیان نەدانەوە. لەدواییدا عەلی حەلاو کۆنگرەکە بەجێدەهێڵێت. ساڵانێک لەدواییدا، لە دەوروبەری حەفتاکاندا، عەلی حەلاو، وەک دەیەها و سەدەها مرۆڤی تری ئەم شار و وڵاتە، لە گەرمەی هەرا و زەنای سیاسەتدا تیاچوو.

## ئێوە ملتان لە چەقۆ دەسوون!

ساڵی ١٩٦٢بوو، ئێمە، من و وەستا عەبدوڵڵای مەڵکەندی و وەستا کەریمی حاجی قادر، بۆ بۆنەی یەکی ئایار و بەمەبەستی خستنەڕووی چەند داواکارییەکی کرێکارانی بینا یاخود بیناسازیی، سەردانی بەڕێوەبەری ئەمنی سلێمانی ئەو سەردەمەمان کرد کە ئەوکات سەر بە پارتی بوو و ناوی حسێن شێروانی بوو، پاش ئەوەی کە داواکانمان خستە پێشچاوی بەڕێزیان، شێروانی هەر لە شوێنی خۆیدا وەڵامیدایەوە و وتی: وادیارە کە ئێوە ملتان لە چەقۆ دەسوون!.

لەڕاستییدا وەڵامەکەی شێروانی وەڵامێکی زۆر سەیر بوو بەلامەوە! کەوتمە سەر خەیاڵی ئەوەی کە بۆچی دەبێت خستنەڕووی داواکاریی، یەکسانبێت بە ملسووین لە چەقۆ؟! لەو کاتەدا عەلی لالەمین، کە کادرێکی ناسراوی پارتی بوو، خۆی کرد بە ژووردا و جیاواز لە حسێن شێروانی زۆر بەڕێزەوە بەخێری هێناین و پێشوازیی لێکردین و چای بۆ بانگکردین، بەڵام وەڵامەکەی شێروانی وەڵامی هەوەڵ و ئەخیر بوو کە بۆ داواکارییەکانمان وەرمانگرت.

## مەحکەمەی وادی

هەوری چڵکن و گێژەڵوکە و غوباری ڕەشی کودەتا خوێناوییەکەی هەشتی شوباتی ساڵی ١٩٦٣ی بەعسییە فاشیستەکان، لە مانگی حوزەیرانی هەمان ساڵ گەیشتە سلێمانی، تەمی تیرۆر و ڕەشبگیریی سەرتاپای شاری داپۆشی، نزیکەی دوو هەزار هاووڵاتیی سڤیل دیل و دەستگیر و یەخسیر و دەستەبەسەرکران و ڕەوانەی تەویلەی هێسترەکانی حامییەی سلێمانی کران.

ئەو خەڵکە زۆرە ناچارکران بەوەی کە بەو هاوینە گەرم و سووتێنەرە لە تەویلە و لە بن جەماڵۆن و لەگەڵ ئاخوڕدا هەڵبکەن. زۆربەی ئەو خەڵکە کە ڕاپێچ و پەلکێشی حامییەکە کران، لە شیرین خەودا و لە ماڵەوە ڕفێنرابوون، هەر بۆیە زۆربەیان بە جلوبەرگی ماڵەوە یاخود بە بێبەرگ و بە برسێتیی و لە ناو جێدا پەلکێش کرابوون. سەرباری ئەم دەستگیرکردنە خوت و خۆڕاییی

و بێبەهانەیە، یاساوڵەکان گەوڕ گەوڕ دەگەڕان و خەڵکیان هەڵدەبژارد و پەلیان دەگرت و لەگەڵ خۆیاندا دەیانبردە بەر دەم ئەو مەحکەمەیەی کە لە بن خێمەیەک لە بەشی ڕۆژئاوای ئەو سەربازگە گەورەیە کە باروتخانەی لێ بوو دایانمەزراندبوو و بە دوو وشە تاوانێکی ئامادەکراو ساغدەکرایەوە بەسەریدا و پاشان دەبرا چەند هەنگاوێک لەولاوە لەبەر دەم چاڵێکی گەورەدا گولەباران دەکرا و بەردەبووەوە ناو چاڵەکە. وەک دەگێڕنەوە، نزیکەی سەد و هەشتا هاووڵاتیی سڤیل کە کوردبوون تاکە تاوانیان بوو، ئەو ڕۆژە بە فەرمانی ئەو مەحکەمەیە کە ناوی (وادی)یان لێ نابوو، گوللەبارانکران. یەکێک لە قوربانییەکانی ئەم کۆکوژییە لەتیف ڕەباتیی برای خالید ڕەباتی بوو، کە دۆست و برادەر و کەسێکی ئازیزی من بوو.

## بۆ یەکەمین جار کە پارەی مامۆستایان خورا

دەبوو هەر لە سەرەتای جیابوونەوەکەی عەزیز حاج و سەرنەکەوتنی نەخشە و پلانەکەیەوە لە ساڵی١٩٦٧دا، سەرکردایەتیی حیزبی شیوعی هەر هەموویانی دەستگیربکردایە، بەڵام مخابن سەرکردایەتیی حیزب ئەو کارەی پێ نەکرا، ئیتر عەزیز حاج توانی حیزبی شیوعی عێراق لاواز و زەبوون بکات و لە کەناری لەناوچوونی نزیکبکاتەوە.

دەستەکەی عەزیز حاج هەر لە سەرەتاوە خۆیان وا نیشان دەدا کە چالاکیی زۆر مەزنیان بەدەستەوەیە و لەو چوارچێوەیەیشدا ماوەیەکی تر شۆڕشێکی سەرتاسەریی لە هەموو عێراقدا بەرپا دەکەن. جا هەوادارانیشیان لە سلێمانی

هەموو ڕۆژێک لە ئامادەباشیدابوون بۆ ئەو چالاکیی و کارە گەورەیەی کە دەیانوت بەم زووانە ئەنجامی دەدەن.

دواجار کار و چالاکییە گەورەکەیان زا و لەدایک بوو. ڕۆژێکیان کتوپڕ پەلاماری باری ئەو پارە و مووچەیەی پەروەردەی سلێمانییان دا کە لە بانکەوە دەگوازرایەوە بۆ پەروەردە. ئەو دەستەیەی کە ئەم کارەیان ئەنجامدا لە بەر دەم مزگەوتی گەورە هێرشیانکردە سەر ئەو ئۆتۆمبێلەی کە پارەکەی تێدا بوو. دەوترا بڕی پارەکە دوانزە هەزار و پێنجسەد دینار بوو. چەکدارەکان بەپەلە پارەکە بەرەو خانووە قوڕەکان و بۆ ماڵی وەهابی نەقاڕ دەڕفێنن.

لەدواییدا دەرکەوت کە بەشدارانی ئەم کردەیە بریتی بوون لە: شێخ عەلی برای مامۆستا شێخ باقر، حەمە کوڵەباڵ، کە خەڵکی هەڵەبجە و گوندی باوەکۆچەک بوو، سەرحەد ناوێک کە خەڵکی کۆیە بوو، حەمە ڕەشید محێدین، لەگەڵ چەند کەسێکی تریشدا کە من چونکە نایانناسم ناوەکانیان نازانم. گروپەکە بۆ ڕۆژی دواتر حەمە کوڵەباڵیان بۆ هەواڵ و دەنگوباس ناردبوو بۆ سابوونکەران، جا بەرانبەر بە چوخمەکەی سابوونکەران پیاوێکی لێ بوو جگەرچی، ناوی ئیبراهیم بوو، حەمە کوڵەباڵ چوو بوو لەوێ نانێک بخوات، لەم کاتەدا تاقمی جەلالییەکان کە ئەرکی پاراستنی ئارامیی شاریان پێ سپێردرابوو و پێشتر هەواڵی ئەوەیان زانیبوو کە حەمە کوڵەباڵ یەکێک بووە لە بەشدارانی کردەوەکەی دوێنێ کە پارەکەی مامۆستایانی تێدا ڕفێنرا، بە ئۆتۆمبێلێکی پڕ لە چەکدارەوە دەچنە بەر دەم سی و جگەرخانەکە و دیارە دەیانەوێت حەمە کوڵەباڵ دەستگیربکەن

ئەویش خۆی نادات بەدەستەوە و دەبێتە شەڕیان و ئیتر حەمە دەکوژن. ڕاستییەکەی ئێمە تەنها بۆ ڕۆژی دواتر بەوەمان زانی و تا ئەو کاتەیش کەس نەیوێرا هیچ بڵێت. بەم چەشنە حەمە کوڵەباڵ تیاچوو و پارەکەیش بۆ دەستەکەی عەزیز حاج مایەوە کە بێجگە لە خوا و خۆیان کەس نازانێت چییان لێ کرد و دایان بە چی!

بەڵام لەو ڕۆژانەدا باس لەوەیش دەکرا کە هەر یەکەم ڕۆژ دوانزە هەزارەکەیان شاردووەتەوە و پێنجسەد دینارەکەیان داناوە بۆ خەرجیی. هەروەها باس لەوەیش دەکرا کە لە کاتی ڕفاندن یاخود دزینی پارەکەدا کەسێک لای مزگەوتی گەورە بووە بە تەقەوە و بریندار بووە.

## لە بەردبڕینەوە بۆ بلیتبڕین

لەپاش ماوەی پێنج شەش مانگێک لە دامەزرانم لە مەسڵەحەی هاتوچۆی ناو شار، سەعید فەرەج دڕەیی، کە هاوڕێیەکی خۆشەویستم بوو، هات بۆ لام بۆ پیرۆزبایی، منیش کە پێشتر کاری نەقاڕیم دەکرد، پێموت: کاک سەعید ئیشەکەمم لە بەردبڕینەوە گۆڕی بۆ بلیتبڕین. سەعید فەرەج کۆڵێک بەو دەربڕینەم پێکەنی.

## (مقاوەمەی شەعبی) لە سلێمانی

لەپاش دامەزران و خۆگرتنی حکومەتی چواردەی تەمموز، شیوعییەکان لە هەموو عێراقدا و بەو جۆرەی کە شیوعییەکان لە وڵاتانی ئەوروپای خۆرهەڵات کردیان، سوپایەکیان پێکهێنا

بە ناوی مقاوەمەی شەعبی، سوپاکە لە کوڕان و کچانی گەنج و لاوی عێراق دروست بوو بوو و ئامانج لە دروستکردنی بۆ پارێزگاریکردن بوو لە شۆڕشەکە و دەستکەوتەکانی. لە سلێمانیش خەڵکێکی زۆر چوونە ناو ئەو سوپایەوە، ڕەئیس لەتیف کە ئەفسەرێکی لەشکری عێراق بوو و برای قاسم بوو، بوو بە سەرلەشکر و لێپرسراوی سوپای مقاوەمەی شەعبی لە سلێمانی. ڕەئیس لەتیف لە شار دۆستایەتی و ناسیاوییەکی فراوان و بەهێزی پێکهێنابوو لەگەڵ وەستا عەبدوڵڵا عەزیزدا، وەستا عەبدوڵڵا عەزیز ئۆتۆمبێلەکانی خستبووە خزمەتی مقاوەمەی شەعبییەوە و زۆر کات خۆی بە سواری ئەو ئۆتۆمبێلانەوە دەردەکەوت و دەبینرا.

## مەولودەکەی ساڵح دیلان

ساڵی ١٩٧٠، لە کتێبخانەی گشتیی فەرمانبەر بووم کە عەبدوڵڵا کەریم چاوشین بەڕێوەبەری بوو، ڕۆژێکیان ساڵح دیلان مەولودی کرد، بەرانێکی کڕیبوو هێنای بۆ کتێبخانەی گشتیی و لە حەوشی کتێبخانەکەدا بۆیان سەربڕی و گۆشتەکەیان جیاکردەوە و بەشیان کرد، لەدواییدا بیستمەوە کە ساڵح دیلان بەبۆنەی بڕیارێکی مەجلیسی قیادەی سەورەوە مەولودەکەی کردووە کە بڕیار دەرچووبوو زیندانی سیاسی بۆ ئەو کەسانە بە خزمەت ئەژمار بکرێت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان زیندانیی سیاسیی بوون. ساڵح دیلان زیندانیی زۆری چەشتبوو و ئەو بڕیارە هەم خزمەتەکەی و هەم مووچەکەیشی پێی زیادی دەکرد. جا منیش لە حەوشی کتێبخانەکە لە کاتی سەربڕینی قوربانییەکەدا چوومە

لای ساڵح دیلانەوە و پێم وت: ساڵح پێم بڵێ: ئەم مەولودەت بۆ بەعس کردووە یان بۆ پێغەمبەر؟ ساڵح دیلانیش وتی: دە بڕۆ بەشی خۆت ببە و سەرم مەیەشێنە مردوت مرێ!

## ساڵی ١٩٧٨

حیزب و سەرکردەکانی حیزب هەموو خۆیان شاردەوە، جەماوەری حیزب وەک مەڕ و بزن بێ شوان مانەوە و حیزبی بەعس و دام و دەزگاکەیشی، وەک گورگی برسی، بەر بوونە گیانی شیوعییەکان و دەستگیرکردن و ڕفاندن و تێهەڵدان و فەلاقەی شیوعییەکان. دەیانگرتیت و دەیانبردی بۆ ئەمن، تا نەتوتایە بەڵێ شیوعیم بەریان نەدەدایت. کاتێک کە دەیشت وت شیوعیم، بەریان دەدایت، بەڵام کاتێک کە تێکەڵ خەڵک دەبوویتەوە، وەک کەسێکی سووک و ڕسوا سەیر دەکرایت. دەیانوت ئەم زەلامە ئیعترافی کردووە.

هەڵبەتە کاتێک کە ئەمن دەستگیری دەکردیت، بە کێبڵ و دار و هەڵواسین، بیرازێکی باشیان دەکردیت و شەوێک بەو پەرێشانییە و بە گیان و جەستەی سوورەوە بوو و شینهەڵگەڕاوەوە بە سواری ئۆتۆمبێلێکی ئەمن دەیانبردیت لە سەر جادە یاخود شەقامێکی شار فڕێیان دەدایت و نەیاندەبردیتەوە بۆ ماڵەوە.

جا هەریەک لە فەرەج وەلی کە لە فەرمانگەی پۆستە بوو و جەبار کە لە فەرمانگەی مەلاریا بوو و هەردووکیان هاوڕێی خۆمان بوون و ئەندام بوون لە ڕێکخراوی گەڕەکی گۆیژە و مەڵکەندی و خۆم لێپرسراویان بووم، دەزگای ئەمن هەردووکیانی دەستگیرکرد، لەپاش کوتان و تێهەڵدانی زۆر

ئەوجا بەریاندابوون. ئێمەیش کاتێک کە هەواڵی ئەوەمان بیست ئەمن ئازادیکردون، شەو چووین بۆ لایان بۆ سەردانیکردنیان بۆ ماڵەوە، بێئاگا بووین لەوەی کە لە سەر داوای ئەمن پەیمانیان داوە هەر شیوعییەک بێت بۆ ماڵەوە بۆ سەردانیکردنیان، دەسبەجێ ئەمنی لێ ئاگادار دەکەنەوە. ئێمەیش کە من و مامۆستا شێخ جەلال و مەحموود بەرزنجی بووین، چووین بۆ ماڵی ئەم دوو هاوڕێیە، بە هەزار تکا و ڕجا قایلمان کردن کە نەکەن ئەمن لەوە ئاگاداربکەنەوە کە ئێمە سەردانمان کردون. لەدوای ئەوە ئیتر سەردانمان نەکردنەوە تا وردە وردە هاتنەوە سەر خۆیان و ئازار و زامی برین و ئەشکەنجەدانیان ساڕێژبووەوە.

پێموایە ئەو بەرە سیاسییەی کە حیزبی شیوعی لەگەڵ حیزبی بەعسدا کردی، لەلایەک بە قازانجی بەعس شکایەوە و لەلایەکی تر بە قازانجی یەکێتی سۆڤیەت شکایەوە، چونکە حیزبی بەعسی پێ تۆکمە و بەهێز بوو و یەکێتی سۆڤیەتیش سوپاسی حیزبی شیوعی کرد کە توانی لە ڕێگایەوە پەیمانێک یاخود ڕێککەوتنێک لەگەڵ حیزبی بەعس کە لە عێراق دەسەڵاتدار بوو بۆ ماوەی پانزە ساڵ ببەستێت کە بە هۆیەوە چەکێکی زۆریشی بە عێراق فرۆشت و لەدواییدا بۆ شەڕی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێران سوودی زۆری لێ وەرگرت.

## عێراق مێرگێکە لەوەڕی بۆ هەموومان تێدایە

وەستا ڕەئوف، باوکی وەستا عەبدول و خەزووری وەستا ساڵح نوری ڕەباتی، کە لە گەڕەکی خەبات هاوسێ و هاوماڵ بووین و هاموشۆمان گەرم بوو، بە زاری خۆی بۆی گێڕامەوە

کە لە دەهەی حەفتادا، کە تازە شەڕ دەستیپێکردبووەوە، بە کارێک ڕێم کەوتە دەربەندیخان، لەوێ برادەرێکی خۆشەویستم هەبوو چووم بۆ لای چاوم پێیبکەوێت، کاتێک کە چاوم پێی کەوت تەماشا دەکەم چەپ و ڕاست فیشەکدانی داوە لە خۆی و چەکی کردووەتە شانی و بووە بە چەکداری حکومەت دژ بە میللەتەکەی خۆی، واتە جاش. منیش زۆرم پێ سەیر بوو کەسێک هەروا سووک و ئاسان چەک لە دژی میللەتەکەی خۆی هەڵبگرێت، هەر بۆیە پێم وت: ئەوە تۆ چیت کردووە فلان کەس؟ ئەوە کەی لە تۆ دەوەشێتەوە و کاری تۆیە؟ برادەرەکەیشم پێیوتم: کوڕە ئەوە تۆ دەڵێی چی وەستا ڕەئوف گیان، ئەم عێراقە مێرگە مێرگ، لەوەڕی بۆ هەموومان تێدایە!

## بەسەرهاتێکی خۆش

هەموو جار ساڵح دیلان دەیگێڕایەوە و دەیوت: لە ساڵانی پەنجادا کە قوتابخانەی ناوەندیی کچان لە سەروو مزگەوتی گەورە بوو، بەیانیان کاتی دەستپێکردنی دەوامی قوتابخانە، لە دەوروبەری سەرا و مزگەوتی گەورە و لەبەر پیاسەکردنی کوڕان و کچان بۆ یەکتری بینین، ڕێ بەر ڕێبوار نەدەکەوت، منیش ئاگام لێ بوو جەلالی مەلا عومەر کە دواتر لە ئیدارە محەلی بوو بە بەڕێوەبەری خەزێنە و پێکەوە یەکتریمان باش دەناسی و من نوێنەری حیزبی شیوعی و ئەویش نوێنەری پارتی بوو، ئاگام لێ بوو جەلال دەچووە لای ناوەندیی کچان بۆ مێبازیی و دڵداریی کردن، منیش ڕۆژێکیان تەگبیرم لە جەلال

کرد، عەبا و پێڵاوی ژنانەم پەیدا کرد و خۆم لە جەلال گۆڕی و خۆم لێ کرد بە ژن و لەو کاتەدا کە دەوامی قوتابخانە تەواو دەبێت چەند هەنگاوێک لەولای قوتابخانەوە بە بەردەم جەلالدا ڕەتبووم و پێشیکەوتم و جار جار ئـاورم بۆ دەدایــەوە بەو مانایەی کە پێم دەوت شوێنم بکەوە. جەلالیش نەیدەزانی چ باسە چەند هەنگاوێکی زۆر شوێنم کەوت، منیش لە نیوەی ڕێگە عەبام فڕێدا بە ئاسماندا و خۆم لێ ئاشکرا کرد، کاتێک کە جەلال زانی ئەوە منم و پێم ڕابواردووە بە پێکەنین و شەڕەجوێن شوێنم کەوت و منیش لەبەر قاقای پێکەنین وەخت بوو ناوسکم دەپچڕا.

## ڕۆژگارێك کە (ئەبو سەرباز)
## لە ناو شار خۆی شاردبووەوە

ساڵی١٩٧٩ ساڵ و سەردەمی کۆتاییهاتنی مانگی هەنگوینیی بەعس و شیوعی یاخود بەرە سیاسییە تەمەنکورتەکەی نێوانیان بوو. هەر لە ساڵی پێشترەوە، واتە ساڵی١٩٧٨، پەیوەندییەکانی حیزب لەگەڵ بەعس پەیتاپەیتا دەستی بە پچڕان کرد و بەعس بەبیانووی جۆراوجۆر کەوتبووە ڕاوەدوونان و دەستگیرکردن و ڕفاندن و تەنانەت تیرۆری شیوعییەکان لە سەرتاسەری عێراقدا.

چەندین گەنج و لاوی سەربازی سەر بە حیزب لە ڕیزەکانی سوپا بە بیانووی ئەوەی کە لە ڕیزەکانی سوپای عێراقدا شانە و خانەی نهێنییان دروستکردووە و نیازی ئەنجامدانی کودەتا یاخود شۆڕشیان هەیە، دەستگیرکران و دران لە سێدارە. هەر بۆیە حیزبی شیوعی بە نیازی خۆپاراستن کەوتە خۆی و دەستیکرد

بە خۆکۆکردنەوە و دەربازکردنی ئەندامەکانی بەرەو دێهاتەکان و ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان و ئەو ئەندامانەیشی کە حیزب بەهۆی ئەو ڕێ و شوێنە خێرایانەی دەستگیرکردن و ڕاوەدوونـانـەوە کە بەعس گرتنییەبەر فریانەکەوت لە شار بەرەو شاخ دەربازیان بکات، هەر لە شار و لە ماڵی هەندێک لە خێزانە شیوعییەکان یاخود ماڵی دۆست و هەوادار و لایەنگرانی جێباوەڕ و جێمتمانەی حیزبدا حەشـاریدان و شاردنییەوە. یەکێک لەو لێپرسراوانەی حیزب کە حیزب لە کاتێکی دواتر و درەنگتردا لە شار دەربازیکرد، مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی ناسراو بە ئەبو سەرباز بوو. ئەبو سەرباز لە سەر داوای حیزب و بە مەبەستی پاراستنی لە کەوتنە دەست ئەمنی سلێمانی و مولازم موحسین، لە ماڵی (ع.ق) کە خێزانێکی شیوعیی خەڵکی سلێمانی بوون شاردرایەوە. ماوەی چەند لەوێ موختەفی بوو، ئەوەیان زانیارییەکە کە من نیمە و نایزانم. بەڵام ئەو ماوەیە کە ناوبراو لەوێ خۆی حەشاردابوو، وەک ئەندامێکی ئەو خێزانە و بگرە زیاتریش ڕێزی لێگیرابوو و خزمەتکرابوو و ڕەچاوی بارودۆخی کرابوو. بەڵام ڕۆژێکیان پیاوی خاوەنماڵ، کە لە دەرەوە و لە سەر ئیش دەبێت و لە ماڵ نابێت، دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، بە سەر گریان و شەپۆر و شینی خێزانەکەیدا دەگەڕێتەوە. هەر بۆیە پیاوەکە دەکەوێتە دۆخێک لە ترس و لەرز و دڵەڕاوکێوە کە ئاخۆ دەبێت چی ڕوویدابێت! کاتێک کە پرسیار لە ژنەکەی دەکات چی قەوماوە و بۆچی وا دەکەیت؟ ژنەکەی پێی دەڵێت: ئەم کابرایە چییە کە تۆ هێناوتە لە ماڵەکەی مندا حەشارتداوە؟! ئەمڕۆ کاتێک کە تۆ لە ماڵ نەبوویت، پەلاماریدام و ویستی دەستدرێژیم بکاتە

سەر! لەم کاتەدا کابرای خاوەن ماڵ ڕەنگی سپی دەبێت و سەری بە گێژدا دێت و بە جۆرێک تورە و شێتگیر دەبێت دەسبەجێ دەچێت پەلاماری ئەبو سەرباز دەدات و تا دەتوانێت تێیهەڵدەدات و بەدەم تێهەڵدانیشییەوە هەڕەشەی لێدەکات و پێی دەڵێت: بێناموسی خوێڕیی داوێنپیس، ئەگەر ئێستا ڕادەستی ئەمنی سلێمانی و مولازم موحسینت بکەم، کێ پێم دەڵێ ناهەقییت کرد! ئەگەر ئەوە لە داهاتوودا بە ناپاکیکردن لەگەڵ حیزب و بوون بە پیاوی ئەمن و ڕژێم لە سەرم نەدەکرا بە ماڵ، هەر ئێستا بەو دەستانەی خۆم دەمدایت بە دەست مولازم موحسینەوە. لەپاش ئەوە کابرای خاوەنماڵ کە بەهۆی بوونی ئەبو سەرباز لە ماڵەکەیدا پەیوەندیی لەگەڵ حیزب لە شاخ هەیە، پەیوەندیی بە حیزبەوە دەکات و داوایان لێ دەکات کە هەرچی زووە ئەم ناکەسی ناپاکە لە ماڵەکەی دووربخەنەوە و بیبەنە دەرەوە، ئەگەرنا خۆی بە دەستی خۆی ڕادەستی مولازم موحسینی دەکات، چونکە ناپاکییەکی لەو جۆرەی لە دەست وەشاوەتەوە.

بەم جۆرە لەدوای ماوەیەک حیزب ئەبو سەرباز لەو ماڵە دەردەکەن و دەیگەیەننە شاخ. ئەو خاوەنماڵە کە ئەم ڕووداوە ناخۆشەی بە سەردا هاتووە، خۆی بە دەمی خۆی ڕووداوەکەی بۆ گێڕامەوە.

## حەسیب قەرەداغی

هێشتا شەڕی عێراق و ئێران دەستی پێ نەکردبوو، هەموو بەیانییەک بە ئیشی فەرمانگەکەم کاتژمێر حەوت لە کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار بووم، تێکەڵییەکی زۆرم لەگەڵ سەندیکای

شۆفێرانی بارهەڵگری کارگەکە و هەروەها لەگەڵ پاسەوان و پۆلیسەکانی بەر دەرگای کارگەکەیش هەبوو و خوا هەڵناگرێت ڕێزێکی زۆریان لێ دەگرتم. یەکێک لە پاسەوانەکان کوڕێک بوو خزمی خۆم بوو، ناوی: حەمەنەجم حەمەجان، بوو.

کاتژمێر حەوت خەڵک لە بەر دەم کارگەکە ڕادەوەستان تاکو دەرگای کارگەکە دەکرایەوە. من، بەپێی بڕیاری پارێزگار، کە لێپراسراوی وەرگرتنی شیش و چیمەنتۆی کارگێڕیی خۆجێیەتی سلێمانی بووم، هەر کات بمویستایە دەچوومە کارگەکە و کارگەکەم جێدەهێشت. ڕۆژێکیان پاسەوانەکان مقۆمۆیان بوو، پرسیم چی ڕووی داوە، وتیان کاک عەلی، حەسیب قەرەداغی کە لێرە فەرمانبەرە و لای خۆی شێخە و کەسێکی خوێندەوار و ناسراوە، کابرایەکی زۆر لووتبەرزە، نە بەیانییان کە دێت بۆ کارگە سڵاو دەکات و نە نیوەڕوانیش کە دەڕواتەوە خوا حافیزی دەکات و دەڵێ کەرتان بە چەند. نازانین بۆچی ئەم کابرایە وایە، مەرحەبای کەس ناکات و هەرچی ڕێز هەیە لێمانی ناگرێت، ئەمە خۆی بە چی و بە کێ دەزانێت؟!

## شوعبەی حەفتاوهەشت

ساڵی ١٩٧٨ ساڵی بەرەو هەڵدێرچوون و لەناوچوونی بەرە سیاسییەکەی نێوان حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی بوو، ئێمە وەک شیوعییەکان، ئاگامان لە هیچ نەبوو حیزبی بەعس ئامادەکاریی بۆ هەموو شتێک لەپاش کۆتاییهاتنی بەرە سیاسییەکە کردبوو، بۆ نموونە لە بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی سلێمانی شوعبەیەکی تایبەت بە لێپرسینەوە و لێپێچینەوە و

لێکۆڵینەوە بە ناوی شوعبەی حەفتاوهەشتەوە دامەزراندبوو، مەبەست لێی شوعبەی شیوعییەکان بوو، چونکە لە ساڵی١٩٧٨ بەرەو سەر پەیوەندیی بەعس و شیوعی بەتەواوی تێکچوو.

لە ماوەی ئەم ساڵانەی دواییشدا ئەحمەد دوری، کە ئەفسەری ئەمن بوو لە بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی سلێمانی، کرابوو بە لێپرسراوی ئەم شوعبەیە، بەڵام ئەحمەد دووری لەدوای ڕاپەڕین و کۆڕەو و گەڕانەوەی سەرلەنوێی بەعس بۆ سلێمانی، لە ناو بازاڕ کوژرا.

## کابرای دۆم چی بە کچەکەی وت؟

ساڵانی شەست لە سلێمانی و لە ڕۆژئاوای باخی شێخ لەتیفی دانساز، گەڕەکی دۆمەکان یاخود کانیی دۆمان هەبوو و دۆمەکان کە هۆزێکی کوردن، وەک نەریتی ساڵانەی خۆیان هەموو ساڵێک دەچوون بۆ سەر شێخەکەیان کە لە سەید سادق بوو و ناوی شێخ تەها بوو.

جارێکیان بۆ جەژنە پیرۆزە بۆ ماڵی ناسیاوێکم لەو دەورە، ڕێم کەوتە ئەو گەڕەکە، بە ڕێکەوت کابرایەکی بەژن بەرزم بینی کە خەنجەرێکی مشتو سپی بە بەر پشتوێنەکەیەوە بوو و کچێکی شەش حەوت ساڵانەی لەگەڵدابوو و لە کۆڵانێکدا ڕاوەستابوون و لەگەڵ ئافرەتێکی شۆخدا بە شەڕ هاتبوون و قڕەقڕیان بوو.

کابرا و ژنە وەک دوو ناحەز بە چەپ و ڕاستدا تانە و توانجیان دەگرتە یەکتری، لەم کاتەیشدا کچە بچکۆلانەکە پڕیکردبوو بە بەر پشتوێنەکەی باوکیدا و دەگریا و دەیقیژاند:

باوکە بەقوربانت بم، باوکە بەقوربانت بم. کابرایش هەر هات و هاواری بوو: کەنی لاوە، کەنی لاوە، لە خوام گەرەکە چارۆکە سوورنەکەیت بگەڕێیتەوە ماڵ باوکت.

## عەبە زروف

لە هەڵەبجە پیاوێک هەبوو ئیشی دەلاکیی یاخود سەرتاشین یان پرچ چاککردنی دەکرد و دووکانی هەبوو، زوربەی بەگزادەکانی هەڵەبجە دەچوونە لای ئەو پرچیان چاک دەکرد. ئەم پیاوە هەرچی ڕووداو و بەسەرهاتێکیان بۆ بگێڕایەتەوە دەیوت: ئیتر زروفەکەی وایە، هەر بۆیە خەڵکی ناویان لێ نابوو عەبە زروف.

## فەوزایە

لە سلێمانی و لە شەقامی مەولەوی ئێستا، (کتێبخانەی گەلاوێژ) هەبوو، خاوەنەکەی ناوی ڕەئوف مەعروف فەتاح بوو، ڕۆژانە بە دەیان کەس ڕوویان دەکردە کتێبخانەکەی بەتایبەتی بۆ کڕینی ئەو ڕۆژنامە و بڵاوکراوانەی کە لە سەرانسەری عێراقدا دەردەچوون و ڕۆژانە دەگەیشتنە کتێبخانەکەی.

زۆر کات کتێبخانەکەی گەلاوێژ شوێنی دانیشتن و گفتوگۆی هەندێک لە خەڵکیش بوو و جاری وابوو باسی هەر بابەت و پرسێک بکرایە لای کاک ڕەئوف بە یەک وشە دەیبڕاندەوە و دەیوت: (فەوزایە)، لەبەرئەوە دەربڕینی فەوزایە خەریکبوو دەبوو بە نازناوێک و بە سەرخاوەنی کتێبخانەکەدا دادەبڕا.

## چونکە کورد میللەتێکی بێکەسە

حەمەی ئەحمەدی تەها، یەکێک بوو لە پیاوە خوێندەوارەکانی سلێمانی، لە کۆڕی ڕۆشنبیریدا بە کامەران موکری ناسراوە. کاکە حەمە یەکێک بوو لەو خوێندەوارانەی کە زوو زوو سەردانی ڕەئوف مەعروفی خاوەنی کتێبخانەی گەلاوێژی دەکرد، جارێکیان کە بە ڕێکەوت منیش لەوێ بووم لە کتێبخانەکە، لەگەڵ ڕەئوف مەعروف سەبارەت بە بەرە سیاسییەکەی حیزبی شیوعی و بەعس کە لەو ڕۆژانەی سالانی حەفتادا لە ئارادا بوو، مشتومڕیان بوو، ڕەئوف مەعروف، وەک من، لە حیزبی شیوعییەوە نزیک بوو و پشتیوانیی لە هەنگاوی حیزبی شیوعی دەکرد کە بەرەی لەگەڵ بەعس پێکهێنابوو، بەلام کامەران موکری مەیلی کوردایەتی و پارتایەتی هەبوو و گلەیی و ڕەخنەی زۆری هەبوو لە حیزبی شیوعی و هەڵوێستەکانی. لە بیرمە کامەران موکری بە ڕەئوف مەعروفی وت: دەبوو حیزبی شیوعی لەگەڵ کورددا بووایە نەک لەگەڵ بەعس، چونکە کورد میللەتێکی بێکەسە.

## دەتکوژم، دەتکوژم

وەک وتم زۆر کەس بەمەبەستی دانیشتن و قسەوباس و گفتوگۆکردن و بیروڕا گۆڕینەوە سەردانی کتێبخانەی گەلاوێژی ڕەئوف مەعروفیان دەکرد. یەکێکی تر لەو پیاوە ناسراوانەی سلێمانی کە هاموشۆی کتێبخانەکەی دەکرد، عەلی ئەحمەدی تەهای برای کامەران موکری بوو، جارێکیان کە دیسان بە ڕێکەوت منیش لەوێ بووم و هەمدیس باس باسی بەرەکەی حیزبی شیوعی بوو لەگەڵ بەعس، عەلی لەگەڵ ڕەئوف

مەعروف کەوتبووە مشتومڕێکی ئەوەندە توندەوە کە خەریکبوو مشتومڕەکە وەردەگۆڕا بۆ دەمەقڕە و شەڕ، ڕاستییەکەی منیش پشتگیریم لە قسەکانی ڕەئوف مەعروف کرد، ئیتر کاتێک کە لە کتێبخانەکە هاتینە دەرەوە بڕۆین چونکە کات خەریکبوو دەبوو بە نیوەڕۆ، عەلی ئەحمەدی تەها لە دەرەوە گرتمی و وتی: گوێ بگرە: دەتکوژم، دەتکوژم. منیش وەڵامم نەدایەوە و قسەکانیم بە سادە و ئاسایی وەرگرت و وتم ڕەنگە لەوە دڵگرانبووبێت کە پشتگیریم لە قسەکانی ڕەئوف مەعروف کرد.

## گەڕپێکردنێکی تری ئەمنی سلێمانی

ساڵی١٩٨١ بوو، لە ئەمنی سلێمانییەوە بانگکرام کە سبەینێ بەیانی بچم بۆ ئەمن سەردانێکیان بکەم لەبەرئەوەی کە هەندێک ئیشیان پێمە! خوا هاوار، خێر، تۆ بڵێی چی ڕوویدابێت! ئەوکات بەڕێوەبەرایەتیی ئەمنی سلێمانی بەرانبەر بە فیرقەی عەسکەریی بوو لە ڕیزی ئوتێل سەلام. کاتێک کە چوومە ژوورەوە لە پرسگەکە کە کۆمەڵێک خەڵک دانیشتبوون دایاننیشاندم.

پاش بەینێک کە نزیکەی دە خولەکێکی پێ چوو، ئەفسەرێکی ئەمن هات بۆ لام و پێی وتم وەرە لەگەڵم. بە ڕاڕەوێکدا ڕەتبووین تا گەیشتینە بەر دەم هۆدەیەک، ئەفسەرەکە بە هێواشی دەرگای ژوورەکەی کردەوە و لەگەڵ چوونە ژوورەوەی خۆیدا داوای لە منیش کرد کە بێمە ژوورەوە. لە ژوورەکەدا سێ کەس دانیشتبوون یەکێکیان کەمال پشدەری بوو.

لە سەر کورسییەک کە ڕووبەڕووی خۆیان دایاننابوو، فەرمووی دانیشتنیان لێکردم، کەمال پشدەری ڕووی قسەی لێ

نام و وتی: دوێنێ بەیانی ڕۆژی یەکشەممە کاتژمێر ئەوەندە لە سەروو ئامادەیی سلێمانییەوە زیلێکی سەربازیی کە لەو شەقامەوە ڕەتبووە نارنجۆکێک هەڵدراوەتە ناوی، پاش کەمێک کەسێک کە ئافرەت بوو تەلەفونی کرد بۆ ماڵی ئێوە و وتی: ئیشەکەمان جێبەجێ کرد. ئێستا تۆ پێمانبڵێ ئەو ئافرەتە کێ بوو کە ئەو تەلەفونەی کرد و ئەو کەسەیشمان پێ بناسێنە کە ئەو نارنجۆکەی هەڵدایە ناو زیلەکەوە؟! منیش، کە دەتوت لە سەر بانێکی بەرزەوە بەردراومەتە خوارەوە، دۆشم دامابوو و بێئاگابووم لەو شتانەی کە دەیوت و لەوەی کە ڕووداوێکی لەو جۆرە ڕوویدابێت، وتم: من، بەگوێرەی ئیشەکەم لە فەرمانگە و بەپێی بڕیاری پارێزگار، هەموو ڕۆژێکی یەکشەممان کاتژمێر حەوتی بەیانی لە کەرکووکم بۆ وەرگرتنی شیش، بۆ دڵنیایی دەتوانیت لە فەرمانگەکەم پرسیار بکەیت، لەبەرئەوە من ئەو ڕۆژە لە کەرکوک بووم و ئاگام لە ڕووداوی وا نییە و نازانم باسی چی دەکەیت! کەمال پشدەریی ماوەیەک بێدەنگ بوو، ئینجا دەستیکردەوە بە قسەکردن و وتی: تۆ عومەری برات موتەمەڕیدە و لای شیوعییەکانە، مانگی چواری ئەمساڵ بە سەردانێکی نهێنیی گەڕاوەتەوە ناو شار و لە ماڵی خوشکەکەت لە گەڕەکی ئیبراهیم پاشا ماوەتەوە و تۆیش چوویت سەردانت کردووە! ، منیش وتم: من خوشکەکەم لە ساڵی١٩٨٠دا کۆچی دوایی کردووە و ئاگام لەوە نییە کە براکەم گەڕابێتەوە و بۆ هیچ ماڵێکیش نەچووم بۆ ئیبراهیم پاشا. ئینجا پرسیارێکی تری کرد و وتی: تۆ چاوت بە ئیسماعیل نەسروڵڵا کەوتووە کە موتەمەڕیدە و شەو لەگەڵ چەند موتەمەڕیدێکی تر هەڵیانکوتاوەتە سەر

سلێمانی و ئارپیجییان ناوه بە دەرگای مەسڵەحەی ئەقلی ڕیکابەوە لە گەڕەکی ڕزگاری. منیش وتم: ڕاستە کە من لە سالانی حەفتا، ئەو کاتەی کە شیوعی بووم لەگەڵ ئیسماعیل نەسروڵلادا پێکەوە کارمانکردووە، بەڵام ئەوەی کە شەو ئیسماعیل نەسروڵلا گەڕابێتەوە ناو شار و ئارپیچی نابێت بە دەرگای مەسڵەحەوە، ئاگام لە شتی وا نییە و نازانم.

جا ئەم پرسیارانە کە کردیان لەگەڵ وەڵامەکانی من هەموویان نووسینەوە ئینجا وتیان: بڕیارێکی مەجلیسی قیادەی سەورە هەیە دوای ڕاوەستانی شەڕ لەگەڵ ئێران ئێوە وەک کەس و کاری موتەمەڕیدین هەمووتان دەستگیر دەکەین و کۆتان دەکەینەوە و ئەودیوی سنووری عێراقتان دەکەین. پاشان وتیان: وەڵامی ئەم پرسیارانەمان بدەرەوە: چەند برات هەن؟ چەند خوشکت هەن؟ چەند ئامۆزا و چەند خوشکەزات هەن و چەند خوشکت شوویان کردووە و چەندیان شوویان نەکردووە و ناوی هاوسەری خوشکەکانت و ئیش و کاریان و چەند خاڵت هەن و خاڵۆزاکانت ناویان چییە، ئینجا کەس و کاری خێزانم و هەموویان لای خۆیان نووسی. ئەم زانیارییانە کە لە ئەمن لێم وەرگیران بۆ شتێک بوو پێیان دەوت سەحیفەی ئەعمال، ئینجا وتیان لەدوای ڕاوەستانی شەڕ ئەو بڕیارەی مەجلیسی قیادەی سەورە بە تان و پۆیەوە جێبەجێ دەکەین.

زێدەڕۆیی ناکەم ئەگەر بڵێم ئەم لێپێچینەوە و لێکۆڵینەوەیەیان لەگەڵم نزیکەی دوو کاتژمێری خایاند، دواتر کە گەڕامەوە بۆ فەرمانگە و پێشتر شەو بە تەلەفون برادەرێکمم ئاگادارکردبووەوە کە سبەینێ ناتوانم زوو بێم بۆ فەرمانگە چونکە لە ئەمنەوە

بانگیانکردوم، برادەرەکەم کۆمەڵێک برادەری ترمی لە فەرمانگە تێگەیاندبوو وتبووی بە هەقی خوا عەلی حامید تیاچوو، چونکە ئەوە خەریکە دەبێت بە نیوەڕۆ، کەچی هێشتا لە ئەمن نەگەڕاوەتەوە!

## بانێك و دوو هەوا

لە سالانی شەست، هەندێک کەس لە خەڵکی سلێمانی، سوێندیان بە گۆڕی شێخ مەحموود دەخوارد، بەڵام جوێنیان بە دایکی شێخ لەتیف دەدا!

## قەسابەکە

بلەی حەمە خورشە، ئیبراهیم محەمەد خورشید، کە لە ڕێگای کار و کاسپیی قەسابییەوە لە سلێمانی ناوبانگ و کەسایەتییەکی بۆ خۆی پەیداکردبوو، بەردەوام جەڵەبی ئاژەڵی هەبوو بۆ قەسابخانە، گوزەران و بژێویی باش بوو. دووکانەکەی لە ژێر ئوتێل بێخاڵ بوو و ماڵەکەیان لە ڕۆژئاوای ئامادەیی پیشەسازیی بوو. هۆکاری سیاسەت، لە دەهەی هەشتاکاندا، لە یەکێتیی دابڕی، باس لەوە دەکرا کە لە ناو ئەو باڵەدا بووە کە ئیشیان بۆ عەدنان خەیروڵڵا کردووە. سەرەنجام ڕۆژێک لە سەر ڕێگای ماڵەوە بەرەو بازاڕ تیرۆرکرا.

## هەزار دینارەکەی ئەحمەد حەسەن بەکر

موکەڕەم تاڵەبانی، کە لە سەردەمی ئەحمەد حەسەن بەکردا وەزیری زیراعە و ڕەی بوو و بە سەرپەرشتیی شارەزایانی

بـواری دروستکردنی بـەنداو و بەربەستە ئاوییەکان و لە سەردەمی وەزارەتەکەیدا بەنداوی سەرساری دروستکرد کە پێیشیان دەوت واوی و چەند کۆمپانیایەکی بیانیی کارەکەیان جێبەجێ و تەواوکرد، بۆ خزمایەتیکردن و ژن و ژنخوازیی تێکەڵاوی بنەماڵەکەی سەعید بەگ–ی بەڕێوەبەری پێشووتری تاپۆی سلێمانی بوو و خوشکەکەی سەعید بەگی خواست. باخی سەعید بەگ، لە ناوی ئەم سەعید بەگەوە هاتووە. جا لەو کاتەدا کە ئەحمەد حەسەن سەرۆک کۆمار بوو، وەک دەست و دیاری و پیرۆزبایی، هەزار دیناری نارد بۆ موکەڕەم تاڵەبانی، بەڵام موکەڕەم تاڵەبانی هەزار دینارەکەی لێ وەرنەگرت و ناردییەوە بۆ ئەحمەد حەسەن بەکر.

## خەمت نەبێت، ژێر قەنەفەکە پڕێتی لە شووتی

لـە هـەشـتـاکـانـدا، حکومەتی بـەعـس بڕیـارێـکی دەرکـرد، بەگوێرەی ئەو بڕیارە هەر کاسپ و خاوەنکارێک لەو دەوڵەمەند و خاوەنکارانەی کە لە حکومەتەوە نزیکن، لەبری ئـەو باج و خـەراجـەی کە دەیـدەن بە حکومەت، دەتـوانـن پڕۆژەیەکی خێرخوازیی لـە نموونەی قوتابخانە یـان هـەر پڕۆژەیەکی تری خێرخوازیی دروست بکەن. عەلی بۆسکانی، کە پیاوێکی زەنگینی شار و نزیک لە حکومەت بـوو، لەم چوارچێوەیەدا و لە گەڕەکی بەختیاری، قوتابخانەیەکی دروستکرد. هەموو کارەکانی جێبەجێکردن و تەواوکردنی قوتابخانەکەی لە ژێر چاودێریی خۆی و بە سەرپەرشتیی خاتوو نەزیرە حارس بـوو، کە ئەندازیاری کارگێڕیی خۆجێیەتی بـوو. هەروەها لە

ژێر چاودێریی و سەرپەرشتیی کارگێڕیی خۆجێیەتی شیش و چیمەنتۆ و کاشیی و لوولەی ئاو و کەرەستەی کارەبای بۆ قوتابخانەکە وەرگرت. من خۆم کەرەستەی ئاو و کارەباکەم لە مەخزەنی هوانە بۆ وەرگرت.

نیوەڕۆیەکیان، من و جەلال کەریم سەرشەقامی و عەزیز مەحموود کە شۆفێری تایبەتی عەلی بۆسکانی بوو لەگەڵ عەلی بۆسکانی، لە سەر ئیشکردن لە قوتابخانەکەوە گەڕاینەوە و لە ماڵی عەلی بۆسکانی میوان بووین کە لە پشت باخی گشتی بوو. عەلی بۆسکانی نازانم خۆی هەر لە نانخواردندا وا دەستوبرد بوو یاخود ئەو نیوەڕۆیە وا بەپەلە نانەکەی خوارد؟! هەر لەگەڵ لە نانخواردنیش بووەوە دەستی برد بۆ ژێر قەنەفەکەی پشتی و شووتییەکی دەرهێنا و کردی بە دوو کەرتەوە و پەیتا پەیتا ناوی شووتییەکەی هەڵکۆڵی و لە بەرەوە هەموو شووتییەکەی خوارد! لەڕاستییدا من زۆرم پێ سەیر بوو، لە بەر خۆمەوە وتم: چۆن هەر خۆی بە تەنها و بە سەر ئەو چێشت و نانەدا شووتییەکی بۆ خورا! لەم کاتەدا کە من داڵغەم ڕۆیشتبوو، عەلی تەماشایەکی کردم و وتی: چییە! خەمی ئەوەتە کە شووتی نەماوە؟ خەمت نەبێت ژێر قەنەفەکە پڕێتی لە شووتی.

## حەمەی فەرەج ئەفەندی

لە ساڵانی پەنجادا و لە بەر دەم گەڕاجەکەی حەمەی فەرەجە فەنی بەرانبەر بە چایخانەی حەمەڕەقی جاران و لای دەرگاکەوە، پیاوێکی سی و جگەرچی لێ بوو کە سی و جگەری دەبرژاند و ناوی جەلیل بوو. بە هاوین و زستان و هەموو وەرزێک لەسەر

ئەو شۆستەیە بە چوارمشقی دادەنیشت و جگەر و گۆشتی لە شیش دەدا و دەیبرژاندن و ئەمە کار و کاسپییەکەی بوو.

جا لای جەلیلی جگەرچی بوو بوو بە شوێنی بەزم و قسە و باسی خۆش و پێکەنیئاوەر. جەلیل بەم کار و کاسپییە کوڕێکی پێگەیاند بوو بە ئەفسەر و سەر بە حیزبی شیوعی بوو، ناوەکەیم نایەتەوە یاد. هەر لەو گەڕاجەدا کوڕێکی لێ بوو بە تەمەن دەوروبەری بیست ساڵێک دەبوو ناوی عیزەت بوو، بانگیان دەکرد عیزەت یەک پارچە. کاتێک کە حەمەی فەرەجە فەنی، کە ماڵەکەیان لە ڕۆژهەڵاتی خانەقا بوو و کابرایەکی تێکسمڕاو بوو و بە کێش دووسەد کیلۆیەک دەبوو، بە سواری جیێبەکەیەوە دەهات بۆ گەڕاج و لەدواییدا سواری جیێبەکەی دەبوو و دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، جیێبەکەی دەنیشتە سەر زەوی. کە دەهات بۆ گەڕاجەکە تووشی عیزەت یەک پارچە دەبوو و دەستی دەکرد بە شەڕە جوێن لەگەڵیدا. حەمە جناوی بە عیزەت دەدا و عیزەتیش بە جوێن وەڵامی حەمەی دەدایەوە. عیزەت کابرایەکی بە لەش و لار و بەژن و باڵا بچکۆلانە بوو بەڵام بە حەمەی فەرەجە فەنی دەوت: پیێم بۆت بە یەک شەق ئەوەندەت دووردەخەمەوە لە سلێمانی، بە سێ مانگ نەیەیتەوە ناو شار.

## بۆریی نەوت

حەمە تالیم فەرەج هەبوو، خەڵکی لای نەمەڵ بوو کە لەم چەند گوندە پێکدێن: نەمەڵ، قسرت، گایان، کەماڵان، دەربەند فەقەرە، وێڵەکەی سەروو، وێڵەکەی خواروو و بەوبەر تانجەرۆوەن و سەر بە ناحییەی عەربەتن. ئەم حەمەتالیم فەرەجە پێش

دەستپێکردنەوەی شۆڕش و هاندانی خەڵک، پەیمانی بە ئاوایی نەمەڵ دا کە بۆ هەمووماڵێک بۆرییەکی نەوتیان بۆ ڕابکێشێت.

بریا حەمە تالیم لەبری ڕاکێشانی بۆریی نەوت، بیری لە ڕاکێشانی بۆریی جەوت بکردایەتەوە، بەس نەبوو بۆ تالاوی مەشکە سوودی هەبوو!

## مزگەوت ڕووخاوە، بەڵام خۆ میحرابەکەی هەر ماوە

وەک لە چەند شوێنێکی تری ناو ئەم یادداشتانەدا باسمکردووە، من کاتێک کە لە مانگی دوانزەی ساڵی١٩٩١ لە زیندان ئازادکرام، بە کوێریی هاتمەوە ناو ماڵ و منالم، ئەمە لە کاتێکدا کە بە چاوی ساغ و بینا دەستگیرکرام و لەدوای ساڵێک لە لێکۆڵینەوە و لێپێچینەوە لەگەڵم لە ئەمنی سلێمانی و تکریت و بەغدا، ئەوجا حوکمدرام و بیست ساڵ زیندانیم بە سەردا سەپێنرا. من، لەو ڕۆژەوە کە لە بەندیخانە ئازادبووم، تا دوای ساڵی٢٠١٠ بەردەوام بە پێوتن بە دەمیی و بە نووسراو و کاغەز، داوام لە حیزب و سەرانی حیزب دەکرد کە: بمنێرن بۆ چارەسەری چاوم بۆ دەرەوەی وڵات. بەڵام حیزب و سەرانی حیزب هەموو جار بە بیانووی کەمدەستیی حیزبەوە داواکەمیان بەوە وەڵام دەدایەوە کە توانای ئەوەمان نییە بتنێرین بۆ چارەسەر. ئەم وەڵامە لە کاتێکدا بوو کە ڕێگای چوون بۆ دەرەوەی وڵات و هەندەران بۆ سەرانی حیزب خۆی بوو بوو بە سەرەڕێی کانی ئەوەندە ئاسان بوو.

سەردەمانێک کە مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی لێپرسراوی محەلیی سلێمانی بوو لەدوای ڕاپەڕین و بارەگای ئەوکاتی

محەلی لە گەڕەکی عەقاری یاخود شۆڕش بوو و مەلا ئەحمەد باڵەخانەکەی ئەوبەر بارەگای حیزبی کردبوو بە شوێنی دانیشتنێکی دیوەخان ئاسا بۆ خۆی و لەبری قەنەفە و کورسی، فەرش و دۆشەکی دانابوو لەسەری دادەنیشت و سەرینی پەڕی دانابوو شانی لە سەر دادەدا، جارێکیان چووم بۆ لای و داوام لێ کرد وەک لێپرسراوێکی باڵای حیزب و لێپرسراوی شاری سلێمانی، هیممەتێکم بۆ بکات بەڵکو بمنێرن بۆ دەرەوە بۆ چارەسەری چاوم تا بینایی و چاوم بەتەواویی کوێر نەبووە و نەپوکاوەتەوە و پێم وت: بمنێرن بۆ مۆسکۆ، چونکە دەڵێن: زانستی پزیشکیی لەوێ لە ڕووسیا لە بواری چارەسەرکردنی چاودا پێشکەوتووە. کەچی هاوڕێ ئەبو سەرباز لە وەڵامدا وتی: هاوڕێ عەلی، مۆسکۆ نەما. منیش وتم: هاوڕێ ئەبو سەرباز، یانی چی مۆسکۆ نەما؟! خۆ ئەگەر مزگەوتیش ڕمابێت میحرابەکەی هەر ماوە. مەبەستم لە مزگەوتەکە دەوڵەتی سۆڤیەت و لە میحرابەکەیش نەخۆشخانەکانی ئەو دەوڵەتە بوو. بەڵام ئەو، وەک لێپرسراوێکی بێدەربەست، داواکەمی نەبیست و گوێی پێ نەدا.

ئەو دۆست و هاوڕێیانەی حیزبی شیوعی ئەو دەورانە کە تەمەنیان هی ئەوەیە ئەو سەردەمەی سەرەتای ڕاپەڕینیان دێتەوە یاد و لە بیر ماوە، هەموو شایەدیی ئەوە دەدەن کە مەلا ئەحمەدی بانیخێڵانی، لەو ڕۆژگارەدا کە حیزبی شیوعی خەڵک و جەماوەر و پێشمەرگەیەکی زۆری لە دەور کۆبووبوونەوە، بە بیانووی بێدەرەتانیی و بە ناوی دەستکورتیی حیزبەوە کە گوایە توانای ئەوەی نییە ئەو خەڵکە زۆرە بەخێو بکات،

خەڵک و جەماوەر و تەنانەت پێشمەرگەیەکی زۆری حیزبی ئیزندا و ناردنییەماڵەوە و ئاشبەتاڵی پێکردن. دواتریش خۆی بەیەکجاریی بەرەو ئەورووپا تێیتەقاند و کوردستانی بەجێهێشت.

## دەربارەی ڕۆڵی بەگەکان لە شۆڕشی ئەیلولدا

مەحموود بەگی حسێن بەگی جاف، برای عەبدوڵڵا بەگی جاف لە هەڵەبجە، لە ساڵانی شەستدا زوو زوو دەیوت: من خەڵکەکەم بردە بەر دەم تونێلەکەی دەربەندیخان و خۆم گەڕامەوە بۆ ماڵەوە. ئاخر بەر لە دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلول دژ بە حکومەتی عەبدولکەریم قاسم، دەربەندی بازیان و بەر دەم تونێلی دەربەندیخان داخران.

## کارێزەکەی بەر دەم چایخانەکە

قادر کەریم جۆلا، لە ساڵانی پەنجا و ماوەیەکیش لە ساڵانی شەست، پێکەوە ئیشی نەقاڕیمان دەکرد و خەڵکی گوندی خەراجیان بوو، جارێکیان بۆیگێڕامەوە و وتی: ئەو کارێزەی لە بەر دەم چایخانەکەی حاجی سەمین خەراجیانیدا بوو لە سەر ڕێگای عەربەت سلێمانی و بە موڵک موڵکی ئێمە بوو، باوکم دوو کەڕەت بۆ سۆراخ و دەنگوباسی سەردانی ئەستەنبوڵی کرد، تەماشا دەکات لەوێ، لە فەرمانگەی موڵک و ماڵی دەوڵەتی عوسمانی، بە ناوی بنەماڵەی کاک ئەحمەدی شێخەوە ناونووس و تۆمارکراوە.

## خۆ نانمان بە ساجدا نەسووتاوە، پەلەی چییتە؟!

لە ساڵانی حەفتا و لە سەردەمی بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتنخوازی نێوان بەعس و شیوعیدا، لەو بارەگایەی حیزب کە لای باڵەخانەی دارولتەڵەبە لە سەر ڕێگای گۆڕستانی سەیوان و لە نزیک ماڵی ئەحمەد مارفی نانەوا هەمانبوو و من ئەو دەمە سەرپەرشتیی شانەیەکم دەکرد، کۆبوونەوەیەک سازکرا و تەوەری کۆبوونەوەکە باسی ڕێکخراوەکانی ئافرەتان بوو و مەجید عەبدولڕەزاق کە کەسایەتییەکی شیوعی خەڵکی سلێمانیی بوو هاتبوو بۆ سەرپەرشتیی کۆبوونەوەکە.

دێتەوە یادم، لە کۆبوونەوەکەدا لە مەجید عەبدولڕەزاقم پرسی: ئێمە خەریکی چین؟ نازانم کۆبوونەوە بۆ کۆبوونەوە بە کوێمان دەگەیەنێت و بۆ کوێمان دەبات؟ مەجید عەبدولڕەزاق لە وەڵامدا وتی: خۆ نانمان بە ساجدا نەسووتاوە، پەلەی چیتە؟!

## گوێچکە سووکەکانی حکومەتی بەعس

نوری خەراجیانی و قالەسووری شۆفێر و حاجی نامیق خەراجیانی، سەردەمێک لە گەڕاجەکەی ئەسحابەسپی گوێچکە سووکەکانی حکومەتی بەعس بوون.

## گوێچکەکانی حکومەت لە گەڕەکی خەبات

لە ساڵانی شەست بەدواوە، سێ کەسی دیار و دەرکەوتوو هەبوون وەک سێکوچکەیەک لە گەڕەکی خەبات گوێچکە سووک و بیستەرەکانی حکومەتی ئەو سەردەم و ڕۆژگارە بوون و

هەر ڕووداو و دەنگۆ و دەنگوباسێکیان ببیستایە دەسبەجێ دەیانگەیاندە حکومەت.

ئەو سێ کەسەیش ئەمانە بوون: مەلا ساڵحی دووکاندار، حاجی عومەر ئەبوبەکر زڕگوێزیی کارەباچی و موختاری گەڕەکی خەبات. ئەم سیانە هەرسێکیان پەیوەندییان لەگەڵ عەلی خەلیفە جافەرانی هەبوو.

## لە ئاستی گەڕەکی گاوران، غەزەب دەبارێت

شێخ عوسمانی شێخ مارفی نێرگزەجاڕیی هەبوو، ماڵەکەیان لە سەرکارێز بوو. ئەم شێخ عوسمانە پیاوێک بوو ئاودامان جلی سپی لەبەردابوو و هەر جارێک کە دەچوو بۆ بازاڕ لەدواییدا دەڕۆیشت لای جەرجیس-ەوە لە سابوونکەران سواری پاس دەبوو و بە پاس دەڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە. جا کاتێک کە پاسەکە لە گەڕەکی گاوران نزیک دەبووەوە، عابا سپییەکەی دەدا بە سەری خۆیدا و دەیوت: لە ئاستی گەڕەکی گاوران، غەزەب دەبارێت. ئێمەیش پێمان دەوت: باشە تۆ بۆچی لە ئەسحابەسپییەوە بە پێ ناگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە، تاکو خۆت لەم غەزەبە بپارێزیت کە بە سەر گەڕەکی گاوراندا دەبارێت؟!

## دکتۆر فارس

دکتۆر فارس، کە نوێنەری جووتیاران بوو و لە ڕێکخراوی جووتیاران کاری دەکرد، هەموو جارێک دەیوت: ئەگەر کوژرام، نائیب عەبدوڵلا کوشتومی.

## ئێمە هەموو درۆمان کرد، تۆ ڕاستت کرد

شێخ عەبدولی تافان هەبوو لە قەرەداغ، بە هۆی ماڵی شێخ نەجمەدینی برای بەهادین نورییەوە یەکترمان باش دەناسی، مانگی دوانزەی ساڵی ١٩٩١ کاتێک کە لە بەندیخانە ئازادبووم و ڕۆژێک سەردانی مقەڕم کرد، لە حەوشەی مقەڕ ڕاوەستابووم، بە دەنگی بەرز هات بۆ لام و وتی: هاوڕێ عەلی حامید، ئێمە هەموو درۆمان کرد، تۆ ڕاستت کرد.

## ڕۆژگارێك کە پارتی کارەبای سلێمانی دەبڕی

لە دەهەی حەفتادا، بەشێکی زۆر لەو کارەبایەی کە دەهات بۆ سلێمانی، لە کەرکووکەوە دەهات، ئەو کاتەیش حیزبی شیوعی لەگەڵ بەعس بەرەیان هەبوو، زۆرجار پێشمەرگەکانی پارتی کارەبای بازیانیان دەبڕی، حیزبی شیوعییش دەینارد بۆ چاککردنەوەی کارەباکە، شەوێکیان پێشمەرگەکانی حیزبی شیوعی لە بازیان لەگەڵ پێشمەرگەکانی پارتی تووشی شەڕ هاتن، دوو پێشمەرگەی حیزبی شیوعی لە شەڕەکەدا تیاچوون، یەکێکیان کوڕی عەبە هەورامیی برای حەبیب هەورامی بوو.

## سابیرە لووتەی عەریف ئەمن

لە ساڵانی حەفتادا، نائیب عەبدوڵڵا، کە لێپرسراوی سلێمانی حیزب بوو، سابیر مستەفا کە ئەندامی حیزب بوو، وەک خەتمایل دەنێرێتە ناو دەزگای ئەمنی حکومەتی بەعسەوە. جارێکیان سابیر فەرمانێکی نهێنیی ئەمنی سلێمانیی دزە پێ دەکات و دەیبات بۆ نائیب عەبدوڵڵا کە تیایدا لیستێک بە ناوی بڕێک

کەسایەتیی شیوعی سلێمانی ئامادەکراوە بۆ دەستگیرکردنیان و ناوی نائیب-یش لە ناو لیستەکەدا دەبێت، ئیتر نائیب عەبدوڵڵا بەپەلە فریای خۆی دەکەوێت و خۆی دەشارێتەوە بەڵام ئەمنی سلێمانی خاوەنی ناوەکانی تر دەستگیر دەکات.

سابیر مستەفا پاش ئەوەی دەبێتە ئەمن و بە سابیرە لووتەی عەریف ئەمن ناوی دەڕوات، هەر لە ساڵانی حەفتادا و کاتێک کە شەڕ تازەدەبێتەوە، شەوێک پێشمەرگە دەچنە سەری بۆ ماڵەوە، بەڵام سابیر بەرگریی دەکات و دەست لە پێشمەرگەکان دەکاتەوە، ئیتر هەم پێشمەرگەیەک دەکوژێت و هەمیش خۆی دەکوژرێتەوە.

## عەزیز حاج، چ ماڵێك بوو؟

ساڵی١٩٩٣ و لەدوای ئازادبوونم لە زیندان بە ماوەی نزیکەی ساڵێک، ڕۆژێکیان لەگەڵ یەکێک لە کوڕەکانم چووم بۆ بازاڕ بۆ دووکانی کاک ئەحمەدی چایچی. قەدەرێک بوو لە چایخانەکە دانیشتبووم کاتێکم زانی کەسێک هاتە تەنیشتمەوە دانیشت و دەستی خستە ناو دەستمەوە و توند دەستمی گوشی و ئەملا و ئەولامی ماچ کرد.

لەبەرئەوەی کە من بە نابینایی لە بەندیخانە ئازادبووم، چاوم نەبوو پێی بڕوانم هەر بۆیە نەمزانی کەسەکە کێیە؟ هەر بۆیە وتم: بمبوورە بە خوا ناتناسم، بەڕێزت کێیت؟ وەڵامیدایەوە و وتی: سەعەم، سەعە سوور جافەرانی. چەند جارێکە دەمەوێت بەتایبەتی بێم بۆ ماڵەوە بۆ لات و بتبینم، بەڵام هەلم بۆ نارەخسێت. منیش جارێکی تر دەستم خستەوە ناو دەستی و

توند گوشیمەوە و سەرلەنوێ ئەملا و ئەولایم ماچکردەوە و بە گەرمیی ئەحواڵیم پرسی و چاو و دڵ ڕۆشنیی خۆمم بۆ دەربڕی.

سەعە سوور جافەرانی، لە شەستەکان و بەر لە کەرتکارییەکەی عەزیز حاج، پێکەوە شیوعی بووین و حیزبایەتیمان کردووە. جا سەعە سوور وتی: هەندێک قسە و باس هەن حەز دەکەم بۆتی بگێڕمەوە. منیش فەرمووم لێ کرد و ئامادەیی و خۆشحاڵیی خۆم بۆ گوێگرتن لەو باس و خواسانە بۆ دەربڕی.

سەعە سوور وتی: ڕۆژێکیان بڕیارمدا بەتایبەتی بچم بۆ لای شێخ عەلی برای مامۆستا شێخ باقر. خوا هەڵناگرێت شێخ عەلی زۆر بە ڕێزەوە پێشوازیی لێکردم و میوانداریی کردم. کاتێک کە سەری قسەمان دامەزراند بە شێخ عەلیم وت: بۆچی سەرلەنوێ قیادە مەرکەزییەکەی جارانمان نەژێنینەوە؟ مەبەستم لە جەماعەتەکەی جارانی عەزیز حاج بوو. شێخ عەلی وتی: هەندێک شت هەن با بۆتی باس بکەم. جا لە کاتی ئاخاوتندا لەگەڵ شێخ عەلی ئەوەندە لە یەکترییەوە نزیک دانیشتبووین دەمارەکانی ملیم دەبینی کە ترپە ترپ پلیان دەدا. شێخ عەلی لە نووکەوە هەموو شتێکی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ئەو ڕۆژانەی بۆ گێڕامەوە و وتی: لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا لەگەڵ قیادە مەرکەزی و عەزیز حاج چیمانکردووە، هەر هەمووی کراوە بە ڕاپۆرت و خراوەتە بەر دەست و چاوی ئەمنی سلێمانی. هەروەها شێخ عەلی وتی: ڕۆژێکیان لە ئەمنی سلێمانییەوە بانگکرام، منیش لەدوای ئەو هەموو ساڵە پێم سەیربوو ئەمن بانگم بکات چونکە هیچم لە خۆمدا شک نەدەبرد. شێخ عەلی گێڕایەوە و وتی: لە ئەمن بە ڕێزەوە پێشوازییان لێکردم و چایان

بۆ هێنام، ئینجا کەوتنە دواندنم، فایلێکیان هێنایە بەر دەست کە تایبەت بوو بە ئێمەی قیادە مەرکەزی و ئەو کار و چالاکییانەی کە ئەنجاممان دابوون، چیمانکردووە، بەتایبەتی من وەک شێخ عەلی، چیم کردووە و لە کێم هەڵداوە و کێم کوشتووە و تەقەم لە کێ کردووە و چۆن پارەمان بردووە و چۆن چوومەتە سەر خەڵک و بەشدارییم لە کوشتنی چەند کەسدا کردووە، هەر هەمووی خستە بەر دەستم و نیشانمیدا. لەگەڵ ناوی ئەو کەسانەیشدا کە ئەم ڕاپۆرتانەیان بۆ ئەمن نووسیوە و ڕەوانە کردووە. شێخ عەلی گێڕایەوە و وتی: ئینجا بەڕێوەبەری ئەمن پێیوتم ئێستا ئەگەر بەگوێرەی یاسا بێت دەبێت ئێمە نەهێڵین کە لە ئەمن بچیتە دەرەوە و جارێکی تر دونیای ڕۆشن بە چاوی خۆت ببینیت. بەڵام ئێمە وا ناکەین، فەرموو دەتوانیت بڕۆیت. ئینجا شێخ عەلی پێیوتم: کاکە حەمە سەعید گیان، عەزیز حاجەکەمان ئەم ماڵە بوو کە بۆم باس کردیت.

## کورد، تا مابێت دەبێت هەر ماڵبەکۆڵ بێت

یەکێک لە ڕۆژەکانی ساڵانی هەشتای سەدەی پێشوو، لە ژوورەکەی خۆم، ژووری لێپرسراوی دابەشکردنی چیمەنتۆی پارێزگای سلێمانی، لە کارگەی چیمەنتۆی تاسلۆجە، دانیشتبووم، کابرایەک پاسەوانی بەر دەرکی کارگەی چیمەنتۆکە بوو زۆر جار هەستم دەکرد کە دەیەوێت بێتە ژوورەکەم بۆ لام و هەندێک شتم بۆ باس بکات. ڕۆژێکیان لە ژوورەکەم دانیشتبووم کابرا کتوپڕ خۆی کرد بە ژووردا، منیش بە ڕێزەوە بەخێرم هێنا و فەرمووی دانیشتنم لێ کرد.

کابرا وتی: حەز دەکەم یەک دوو شتت بۆ باس بکەم، وتم: فەرموو. ڕاستییەکەی لە سەرەتادا وامزانی ئەو شتانەی کە بۆمی باس دەکات پەیوەندییان بە کارگەکە و ئیش و کارەکەی منەوە هەیە، بەڵام وا نەبوو.

کابرا بە دەم ڕاکێشانی دەستی بۆ ئەوبەر ڕێگای تاسڵوجە سەری قسەی دامەزراند و وتی: تا بناری شاخەکە، ئەمبەر و ئەوبەری ڕێگاکە گشتی زەوی و زاری هۆزەکەمانە، هۆزی مەنمی، لەو شوێنەدا کراوە بە سەربازگە، لە کاتی درەوی گەنم و جۆدا ئامر لیوای ئەو سەربازگەیە ناردبوی بە شوێنماندا کە لەگەڵ چەند پیاوێکی تری ئاوایی بۆ هەندێک کاری پێویست کە ئەو کاری پێمانە بچین بۆ سەربازگەکە بۆ لای. یەکێک لە پیاوەکانی ئەو دەستە پیاوە کە چوون بۆ لای، من بووم. ئامر لیواکە پێیوتین: لە ماوەی یەک هەفتەدا وەگوێزن. واتە لەم ناوچەیە بار بکەن و بڕۆن. ئەوە ئۆردوگای چەرمەگایە بگوێزنەوە ئەوێ. ئێمەیش داواکەیمان زۆر بەلاوە زەحمەت بوو، ئەم هەموو دەغڵ و کشتوکاڵە چۆن بە هەفتەیەک کۆدەکرێنەوە؟! بە نائومێدیی لە ژووری ئامر لیوا هاتینە دەر، بەڵام من جارێکی تر چوومەوە بۆ لای ئامر لیوا و پێم وت بێقەزابیت یاخوا، ئاخر چۆن دەتوانین بە هەفتەیەک بەرهەمی گەنم و جۆمان کۆبکەینەوە؟! ئامر لیوا وتی: کێشە نییە با دوو هەفتە بێت. ئینجا ڕووم لە ئامر لیوا وەرگێڕا و بەرەو دەرگای ژوورەکەی وەرچەرخام و هەنگاوم نا تاکو بێمە دەرەوە و بەجێبهێڵم و بڕۆم، ئامر لیوا بە توڕەیی گازی کردمەوە و وتی: کورد، تا مابێت دەبێت هەر ماڵبەکۆڵ بێت.

## کاتێك کە خۆیشت نەمایت، چاودێریی منداڵەکانت دەکەین

لە دەهەی هەشتادا و تا بەر لە دەستگیرکردنم لە دوارِۆژی مانگی پێنجی ساڵی ١٩٨٩دا، هەموو چەند مانگ جارێک بانگدەکرام بۆ ئەمنی سلێمانی. وەک باو بوو رِۆژی پێشتر لای دوای نیوەرِۆکەی پیاوێک کە پۆستەچی ئەمن بوو نووسراوی بانگهێشتەکەی دەگەیاندە ماڵەکەم. وەک پێشتریش لە شوێنێکی تردا باسمکرد: لە ئەمنی سلێمانی شوعبەیەکی تایبەت کرابووەوە بە ناوی شوعبەی حەفتاوهەشت کە تایبەت بوو بە لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە و لێپێچینەوە لە شیوعییەکان و لێپرسراوی ئەم شوعبەیەیش ئەفسەرێکی ئەمن بوو ناوی ئەحمەد دوری بوو. هەرچۆنێک بوو بۆ سبەینێ پێش نیوەرِۆکەی چووم بۆ ئەمن.

باڵەخانەی ئەمن گوازرابووەوە ئەو شوێنە کە ئێستا پێی دەڵێن ئەمنەسوورەکە و لە شەقامی سەهۆڵەکەوە بۆی سەریدەکەویتە سەرەوە. کاتێک کە چوومە بەر دەرکی ئەمن کورِەکەی عەلی خەلیفە جافەرانی پاسەوان بوو لە بەر دەرگاکە کە ناوی ساڵح بوو، عەلی خەلیفە خۆیشی مفەوەزی ئەمن بوو. هەڵبەتە هەم عەلی خەلیفە و کورِەکانی منیان دەناسی و هەم منیش ئەوانم دەناسی، چونکە خۆی و کورِەکانیشی ماڵیان لە گەرِەکی خەبات بوو و ئێمەیش ماوەیەکی زۆر ماڵمان لەو گەرِەکە بوو. لە بەر دەرگاکە بە ساڵح-م وت ئەحمەد دوری بانگی کردوم بێم بۆ لای بۆ ئەمن. ساڵح ژوورەکەی نیشاندام و وتی فەرموو بچۆرە ژوورەوە ئەحمەد دوری لەوێیە.

وەختێک کە چوومە ژوورەوە، ژوورەکە ژوورێکی بچکۆلانە بوو، هەر لەگەڵ لە دەرگام دا و دەرگام کردەوە و سەرم بردە ژوورەوە، بانگی فەرمووی لێ کردم و وتی وەرە ژوورەوە. پاشان فەرمووی دانیشتنی لێمکرد، منیش لەسەر کورسییەک کە بەرانبەر بە مێزەکەی دانرابوو دانیشتم. ئەحمەد دوری لە سەر کورسییەکەی کە لەودیو مێزێکەوە بوو و قاسەیەکی لە تەنیشتەوە بوو دانیشتبوو. هەروەها لە سەر مێزەکەی بەر دەمی دوو دەمانچە دانرابوون. دەسبەجێ لێیپرسیم: ئێستا عومەری برات لە کوێیە؟ وتم: هەواڵم لێی نییە و نازانم. ڕاستییەکەی من بەو پرسیارەی زۆر نارەحەت و بێتاقەت بووم هەر بۆیە پێموت: باشە بیسمیلا خۆ دوێنێ بوو کە حیزبی شیوعی لە بەرەدا بوو لەگەڵ حکومەتدا، بۆچی وا دەستتانکردووە بە ڕاوەدوونان و دەستگیرکردنی ئێمە؟! ئەمن و دەزگای ئەمن هەرچەند باشیش بن لە ناو خەڵکدا بەڵام خەڵک هەر بە ناحەز تەماشایان دەکەن. ئێوە لە من دەپرسن براکەم لە کوێیە؟ منیش دەڵێم نازانم. یاخوا کەس قاچی نەچێت لە پیسایی حکومەتەوە، خۆ بە هەزار ئاو بۆی پاکناکرێتەوە. ئەحمەد دووری وتی: عەلی گوێ بگرە با مژدەیەکت بدەمێ، تا خۆت مابیت لە ژیاندا چاودێریی خۆت دەکەین، کاتێک کە خۆیشت نەمایت لە ژیاندا چاودێریی مناڵەکانت دەکەین، ئەوەی وت و لە سەر کورسییەکەی بەرزبووەوە و دەمانچەکەی کە بە لاقەدییەوە بوو لێیکردەوە و ئەویشی لە پاڵ دوو دەمانچەکەی تر لە سەر مێزەکەی بەر دەمی دا نا و لە ژوورەکەی چووە دەرەوە. منیش لە شوێنی خۆم نەبزوام.

چەند خولەکێکی پێ چوو و دەرگای کردەوە و هاتەوە ژوورەوە، بەدەم هاتنەژوورەوەوە وتی: ئەوە ژمارەی تەلەفون، لە هەر شوێنێکەوە هەر شتێکت بۆ هات، ئاگادارمان بکەرەوە، منیش وتم: من هیچ پەیوەندییەکی سیاسیم نییە تاکو خەڵکی شتم بۆ بنێرن. وتی: من دڵنیام کە تۆ پێت خۆش نییە بانگت بکەین بۆ ئەمن، بەڵام ئێمە لە سەر بانگکردنت بۆ ئەمن بەردەوام دەبین، فەرموو دەتوانی بڕۆیت.

## ئەو کۆبوونەوەیەی کە کەس داوای کۆنووسەکەی نەکرد

ساڵی١٩٦٧، دوابەدوای کەرتکارییەکەی عەزیز حاج، کۆبوونەوەیەکی تایبەتیمان بۆ هەموان و بەتایبەتی بۆ شیوعییەکانی سەرشەقام و ئەوانەی کە لە گەڕەکی خەباتەوە بۆ ئابلاخ خۆمان دیاریمان کردبون. کۆبوونەوەکە لە ماڵی نوری لۆقنتەچی لە سەرشەقامی خوارەوە بەرانبەر بە مزگەوتی مەلا حەسەن پیسکەندی لە سەر شیوەکەی جوولەکان سازکرا.

ئەوەی لەم کۆبوونەوەیە لە بیرم ماوە ئەم هاوڕێیانەمان ئاگادار کردبوو کە بەشداربن، گەڕەکی خەبات: عەلی حامید، مەحموود عەبدوڵڵا ناسراو بە مەحموودی عەبەی خوێ، مەحموودی ناسراو بە خولەی پاقلە و خولەی مچە حاجی، مەلا حەمەومین برای شەهید مەلا عەلی کە لە کانیی ماسی تیرۆرکرا، وەستا عەزیز حەسەن، کاک ڕەزا ئەحمەد جافەرانی، مەلا بەکر و عوسمانی برای کە ناسراو بوو بە عوسمانی قالە بەراز، عوسمانی پاقلاوە کە ماڵەکەیان لە خوار مزگەوتی خانەقای مەلا عەلییەوە بوو، حەمەئەمین ڕەشید، حەمەئەمینی بەرید، وەستا مەحموود

قەرەداغی، ئەورەحمانی لێفەدروو، عەزیز جەوهەر ناسراو بە عەزیز کاسکێت، ، مەلا عەزیزی نەقاڕ، وەستا ئەسعەدی بەننا، مەحموود نەقاڕ ناسراو بە خولە سوور، مەحموود نەقاڕ ناسراو بە خولە ڕەش ئابڵاخی، وەستا عەبدوڵڵا نادر لە چوارباخ و نوری لۆقنتەچی و من هەر ئەوەندەم لە بیر ماوە.

مەبەستی کۆبوونەوەکە بۆ ئەوە بوو دوابەدوای جیابوونەوەکەی عەزیز حاج دەستەیەک هەڵببژێردرێت بۆ بەڕێوەبردنی ئەم هێڵە لە خەباتەوە بۆ ئابڵاخ. کۆبوونەوەکە درەنگانێکی شەو کۆتایی هات، بەڵام بە سەرکەوتوویی و دەستەکەمان هەڵبژارد. لەدوای ئەوە بڵاوەمان لێ کرد هەر کەس بۆ ماڵی خۆی. منیش کۆنووسەکەم، کە بە دەستخەتی مەلا بەکر نووسرابوو، برد تاکو بیبەم بۆ دانیشتنی لیژنەی محەلی، بەڵام لە ترسی ئەو ڕۆژگارە و بۆ ئاشکرا نەبوون کاغەزی کۆنووسەکەم لە ژێر دۆشەکی ناو بێشکەی مناڵێکماندا شاردەوە، لەدوای سێ مانگ چوومەوە سەری و دۆزیمەوە! لە دانیشتنی ئەو کۆبوونەوەیەدا، کە ئەوکات حسێن عارف لێپرسراومان بوو، من قسەم کرد، بەڵام کەس داوای کۆنووسی کۆبوونەوەکەی نەکرد.

## بۆچی منی بە گرتدا و ئەوی بە گرت نەدا؟

عەبدولە شەلی چایچی کە خەڵکی وارماوا بوو و لە سەرەتادا ماڵیان لە گەڕەکی خەبات بوو و دواتر گواستییەوە بۆ بەختیاری و لەدوای تێکچوونی بەرە لەگەڵ بەعس و خۆشاردنەوەی ڕێکخستنەکانی حیزب لە شار بێجگە لەوەی کە هاموشۆی ئیش

و کاری نهێنیی حیزبیمان له نێواندا هەبوو، ماڵەکەیشی بوو بوو به وێستگەی ئەو پۆستەیەی که حیزب به نهێنیی له دەرەوە و له شاخ دەیناردەوە بۆ شار و فاروق- کوڕی حەمەعەلی پۆلیس که عازەبانی بوو، ئەو کەسە بوو که زۆر جار پۆستەکانی حیزبی دەبرد له ماڵی عەبدوله شەلی چایچی دایدەنا و منیش زۆرجار دەچووم ئەو بەریدانەم له ماڵی عەبدوله شەلی چایچی وەردەگرت و لەدواییدا ئەم فاروقه یەکێک بوو لەو کەسانەی که له کۆتایی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٨٩دا لای ئەمنی سلێمانی هەواڵی له من دا و ئەمن هاتنه سەرم بۆ ماڵەکەم له گەڕەکی ڕزگاری و دەستگیریان کردم.

تێناگەم، یانی چی فاروق عەبدوله شەلی چایچی به گرتن نەدا که ماڵەکەی وێستگەی دانان و دابەشکردنی پۆسته هاتووەکانی حیزبی شیوعی بوو بۆ ناو شار و زۆر جار فاروق خۆی پۆستەکەی بۆ دەهێنا، بەڵام منی به گرتن دا؟! ئەمه چی دەسەلمێنێت؟ ئایا ئەوە ناسەلمێنێت که عەبدوله شەلی چایچیش هەر دیسان بوو بوو به پیاوی ئەمن؟!

## حەفتا دینارەکەی من و ده دینارەکەی ئەحمەد

ساڵی١٩٨١ و بۆ یەکەم جار لەدوای دەستگیرکردنی ئەندامانی محەلیی سلێمانیی حیزبی شیوعی، که ڕێکخستنەکان هەموو پەرتەوازە و پەرش و بڵاوبووبوونەوە، ئەوکات ماڵمان له گەڕەکی گۆیژە و بەرانبەر به مەخزەنەکەی عەبەی کۆلا بوو، پاش نیوەڕۆی ڕۆژێک که ئەحمەدی برایشم له ماڵمان بوو، کەسێک له دەرگای ماڵەکەمانی دا، کاتێک که چووم دەرگا

بکەمەوە بزانم کێیە تەماشام کرد حەمەی کاکەوڵای قڕگەیی بوو، خوڵقێکی زۆرم کرد بێتە ژوورەوە دابنیشێت، بەڵام نەهاتە ژوورەوە و وتی پەلەمە دەڕۆم و دەچمە دەرەوە ئەگەر شتێکت هەیە بۆ دەرەوە بمدەرێ با لەگەڵ خۆمدا بیبەم. منیش سوپاسم کرد و وتم ئەرەوەڵا شتم هەیە، ڕاوەستە با بۆتی بهێنم، چوومە ژوورەوە و باسەکەم بۆ ئەحمەدی برام گێڕایەوە و پێم وت: شتێکی وا هەیە، جا من حەفتا دینارم هەیە بە حەمەی کاکەوڵادا دەینێرم، ئەحمەدیش وتی هانێ ئەو دە دینارەی منیشی بدەرێ. پارەکەمان دا بە حەمە و خواحافیزیی کرد و ڕۆیشت. لەپاش ماوەیەک حەمەی کاکەوڵا لە سورێن گەڕایەوە و هات بۆماڵەوە بۆ لام و وتی هاوڕێ نائیب زۆر سەلام لە مامۆستا ئەحمەد دەکات و ڕێزی هەیە بۆی! منیش وتم دەستی نائیب خۆش بێت، بۆ دە دینار سوپاسی مامۆستا ئەحمەد دەکات، بەڵام من حەفتا دینارم ناردووە کەچی هەواڵی من ناپرسێت.

## ساڵە پیر ڕۆژگارێک شیوعی بوو

ساڵی١٩٥٩، بە بڕیاری حیزب، سەرلەنوێ هەموو ئەو کەسانەی کە پەیوەندییمان هەیە لە حیزبدا بەسەرکراینەوە و نووسرای ئەندامێتیمان بۆ پڕکرایەوە. لەو کاتەدا شانەکەمان لە سێ کەس پێکدەهات: نووسەری ئەم یادەوەرییانە، فایەق عومەر کە لەدواییدا بوو بە کاتبی مەسڵەحە، ساڵح قادر کە دواتر بە ساڵە پیر و ساڵحی قالەی حەلاو ناوی ڕۆیشت و بوو بە یەکێک لە ناحەز و دوژمنەکانی حیزبی شیوعی و شیوعیکوژەکانی کانیی ماسی و سەرەتای ساڵانی شەست لە

بەر دەم کەبابخانەکەی عەباس ئەبو شوارب بە دەستی خۆی و لە دواوە مەلا حەمەومینی دووکانداری تیرۆرکرد کە ئەندامی حیزبی شیوعی بوو.

## بۆ یەکەمین جار کە لە ئەمنی عامی بەغدا ئەشکەنجەدرام

کاتژمێر دەوروبەری دوانزەی شەوی بەرواری ١٣ لەسەر ١٤ی مانگی ئەیلولی ساڵی١٩٨٩ بوو، لەو ژوورە کە لە ئەمنی عاممی بەغدا لێی بەندکرابووم، دوو یاساوڵ هاتن کەلەپچەیان کردە دەستم و چاومیان بە پەڕۆیەک بەست و چوونە بن هەنگڵم و لەگەڵ خۆیاندا بە پلیکانەیەکدا بردیانمە خوارەوە و بردیانمە ژوورێک. لەبەرئەوەی کە چاوم بەسترابووەوە و نەمدەتوانی هیچ ببینم، بە ناوهێنانیدا لەلایەن ئەمنەکانی هاوڕێیەوە بۆم دەرکەوت ئەو ئەفسەرە ئەمنەی کە لێکۆڵینەوە و لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکردم ناوی خەڵەف بوو و وەک لەدواییشدا باس کرا ئەم خەڵەف-ە لێپرسراوی شوعبەی یەک بوو لە ئەمنی عام کە بە شوعبەی قەلاچۆکردنی شیوعییەت ناسراو بوو.

لەگەڵ بردیانمە بەر دەم ئەفسەر خەڵەف، خێرا بە توڕەیی و بێزارییەکەوە وتی: هەرچییەکت لێدەپرسین دەڵێی ئاگام لێی نییە و نازانم! پۆستەت بۆ دەهات بە ناوی عەلییەوە، نامەیەکت بۆ هات چی تێدا نووسرابوو! مانگانە چل دینارت دەدا بە حیزبی شیوعی و هێشتا دەیشڵێیت ئاگام لە هیچ نییە!؟

تا ئەفسەر خەڵەف ئەم قسانەی لە ڕوومدا نەکرد نەمزانی کێ بەگرتیداوم. لە دڵی خۆمدا دەموت: ئەی باشە عەبدولە شەلی

چاپچی بۆچی و چۆنە دەستگیرنەکراوە کە من پۆستەم لای ئەو بۆ دادەنرا؟! ئەی باشە قومری خانی خێزانی مەحمودی دەلاک بۆچی و چۆن دەستگیرنەکراوە کە من لای ئەو و لە ماڵی ئەوان بڵاوکراوە وناملکە و پۆستەم وەردەگرت؟! باشە ئەو نامەیە کە فاروق بۆ منی هێنا بۆ ماڵەوە، ئەمن لەکوێوە پێی زانی؟! من کە مانگانە چل و جاری وایش بوو پەنجا دینارم دەدا بە فاروق بۆ حیزب، ئەمن چۆن بەمەی زانی؟! کاتێک کە ئەم پرسیار و سەرسوڕمانانەم لەلای خۆم و لە مێشک و خەیاڵمدا لێکدایەوە ئەوجا بۆم ساغبووەوە ئەوەی کە بە گرتیداوم فاروق–ە. بەڵام لە وەڵام بە سەرسوڕمان و پرسیارەکانی ئەفسەر خەڵەف–دا وتم: من فەرمانبەرم و مووچەیەکی دیاریکراو وەردەگرم، ناتوانم مانگیی چل دینار بدەم بە حیزبی شیوعی، ئەو قسەیە ڕاست نییە. ئەگەر ڕاستە کە من نامەم بۆ هاتووە، ئەو کەسەی کە نامەکەی بۆ هێناوم دەبێت بزانێت نامەکە چی تێدا نووسراوە، من نامەم لە هیچ شوێن و کەسێکەوە بۆ نەهاتووە. پاش ئەوە هەزاران کەس هەن ناویان عەلییە، ئیتر بۆچی ئەو عەلییەی کە ناوی لەسەر نامەکە نووسراوە دەبێت من بم، من تۆمەتی وا ڕەتدەدەمەوە و بێئاگایی خۆمتان پێ ڕادەگەیەنم.

هێشتا لە قسەکانم تەواونەبووبووم کاتێکم زانی لەدواوە بە کێبڵ و شەق بۆ پشت و پاشەڵم و بە بۆکس و شەپازلە بۆ سەر و سەکوتم تێمبەربوون و کەوتنە وێزەم. وادیاربوو ئەمنەکان لەمبەر و لەوبەر بەو ڕیزەی کە لە هەردو بەر دروستیانکردبوو ڕاڕەوێکیان لە خۆیان پێکهێنابوو، چونکە هەم لای ڕاست و هەم لای چەپ و لە پاشیشەوە شەق و کێبڵ و بۆکس و شەپازلەم

بەردەکەوت، ئینجا پێشیان دەوتم یاڵڵا بڕۆ، ڕەتبە. منیش بە بەر دەمیاندا ڕەت دەبووم و ئەوانیش لە هەموو لایەکەوە تێیانهەڵدەدام.

درۆ نییە ئەگەر بڵێم ڕەنگە دە تا پانزە جار بەو تێهەڵدانەیان تەختی ئەرزیان کردبم و سەرلەنوێ هەڵیانستاندبێتمەوە و جارێکی تر بە شەق و بۆکس و کێبڵ تێمکەوتبنەوە و تەختی ئەرزیان کردبێتمەوە. لێدانێک کە زۆر ئازاری پێدەگەیاندم و ژانی دەخستە دڵمەوە، ئەو لێدانە بوو کە ئەفسەر خەڵەف خۆی لێمی دەدا، مردم و نەمزانی ئەو شتە چی بوو کە خەڵەف کردبویە دەستی و لەگەڵ دەیکێشا بە دەموچاو و پەناگوێ و ڕوومەتمدا ئاگر و گڕ و تاو لە هەردو چاومەوە دەردەپەڕین.

ئەمنەکان چونکە ژمارەیان زۆر بوو و پێدەچوو پێنج شەش ئەمن بن، بەو ماوەیە لە لێدان لە سێ چوار شوێنەوە سەرمیان شکاند و دەموچاومیان لە چەند لایەکەوە تەقاند، هەر بۆیە چۆڕاوگەی خوێن و لیک و ئارەق لەسەر چەناگەم چۆڕاوگەی بەست.

تا بێتاقەت بوون تێیانهەڵدام، ئینجا بردیانمەوە بەر دەم ئەفسەر خەڵەف. لەم کاتەدا کەلەپچەی دەستم بەهۆی زۆرلێدانمەوە لە مەچەکمدا جەڕیبوو و مەچەکمی بەجۆرێک گوشیبوو لە هەردو مەچەکیشمەوە خوێن بە سەر سک و لەشمدا چۆڕاوگەی بەستبوو. لە سەر کورسییەک دایاننیشاندم و فێنککەرەوەیەک کە موبەڕیدە بوو لە پشتمەوە ئیشی دەکرد.

بەهۆی زەبری کێبڵەکانیان کە کێشابوویان بە سەری پێم و سەر نینۆکەکانی قاچمدا، هەموو نینۆکەکانی قاچم تەقیبوون

و بە ئاستەم دەمتوانی پێ لە سەر ئەرز دابنێم. کاتێک کە دایاننیشاندمە سەر کورسییەکە زۆرم حەزکرد لە هۆش خۆم بچم بەڵکو سڕ ببم و کەمێک ئازار و ژانەکانم بیربچنەوە، بەڵام لە هۆش خۆم نەچووم. نەختێک ئاویان کرد بە دەممەوە، لە سەرەتادا نەموێرا بیخۆمەوە، چونکە ترسام ژەهری تێدا بێت، بەڵام دواتر قیروسیام کرد و بینم پێوەنا و خواردمەوە چونکە زۆرم تینوو بوو.

من کە لێدانی زۆر وڕ و کاس و گێژی کردبووم گوێم لێ بوو ئەفسەر خەڵەف وتی: دەی قسە بکە! ورە و تینم دایە بەر خۆم و وتم: ئاگام لە هیچ نییە، نازانم باسی چی دەکەن. خەڵەف وتی: ئاگات لە هیچ نییە! وتم: بەڵێ. وتی: یاڵڵا بیبەنەوە جارێکی تر بیرازی بکەنەوە. سەرلەنوێ بردیانمەوە بۆ ئەشکەنجەدان.

ئەگەرچی ماوەی ئەم جارەی ئەشکەنجەدانەکە زۆری نەخایاند، بەڵام چونکە لە جاری یەکەم قایمتر و توندتر بوو شل و کوتی کردم و لە پێی خستم. ئینجا خەڵەف بانگی لە دوو ئەمن کرد کە بچنە ژێر باڵم و بمبەنەوە سەرەوە بۆ ژوورەکەم. کاتێک کە بە ڕاڕەوەکــەدا ڕەتبووین و دیاربوو کە خەڵەف چاوی بە دەستم کەوت کە هەردوکیان لە کەلەبچەدا بوون و بەهۆی توندیی کەلەپچەکەوە لە دەستمدا جەڕیبوو و خوێن لە مەچەکم دەچۆڕا، بە دەنگی بەرز و بە توڕەیی بانگی لە یەکێک لە ئەمنەکان کرد کە کلیلی کەلەپچەکەی لەلا بوو و لەو کاتەدا لە ڕاڕەوەکە لەگەڵیان نەبوو کە بێت ئەو کەلەپچەیە لە دەستم بکاتەوە. لەدوای چەند خولەکێک یەکێک هەردو دەستمی گرت و کەلەپچەکەی لە دەستم کردەوە.

لەم کاتەدا بە پلیکانەکاندا سەرکەوتبووینە سەرەوە و گەیشتبووینە بەر دەم ئەو ژوورەی کە لێی بەندکرابووم. لێرەدا ئەفسەری بەر دەم ژوورەکەی خۆم وتی بیبەنە ژووری تاکەکەسیی، بەڵام کەس گوێی بە داواکەی نەدا و بردیانمەوە ژوورەکەی خۆم. کاتێک کە هێنایانمەوە بۆ ژوورەکەم کات دەوروبەری دووی شەو بوو. بەندکراوانی زۆرێک لە هۆڵەکانی بەندکردن خەوتبوون و ئەوانەیشیان کە بێداربوون و منیان بینی کە بەو حاڵە هێنامیانەوە، واقیان وڕما و خەم دایگرتن، ئەو چەند هەنگاوەم بە پێی خۆم تا سەر جێگەکەم بڕی، بەڵام ڕەنگە دوورترین و قورسترین هەنگاوەکانی ژیانم بووبن، چونکە بە هیلاکیان بردبووم و توانای ڕێکردنم نەبوو. چوومە سەر جێگەکەم و دانیشتم و پاڵمدا بە دیوارەکەوە، هاوبەندییەکانم لێمکۆبوونەوە، بەتایبەتی حەمەڕەحیم پێنجوێنی کە لە سەر پەیوەندیی بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە دەستگیرکرابوو. ئەو حاڵەی من بە ڕادەیەک کاری تێکرد کە دەستی کرد بە گریان. بۆ ئەوەی کەمێک لە ئێش و ئازارەکانم کەمبکاتەوە هەستا دەستێک بە شان و ملمدا بهێنێت و بمشێلێت، بەڵام کاتێک کە شان و پشت و ملمی بینی و زانی کە کەڵکی شێلانم پێوە نییە، داوای لێکردم کە سەرلەنوێ پشت بدەمەوە بە دیوارەکەوە. لەم کاتەدا هاوبەندییەکانی ترم بۆ ئەوەی هەڵئاوسان و هەڵتۆقین و تلۆقی قاچ و دەست و پێیەکانم چارەسەربکەن و بنیشێننەوە، هەرچی ناوکی ئەو سەموونە هەبوو کە لە ژوورەکە لەلایان بوو هەموویان لە سەموون دەرهێنا و تۆپەڵیان کرد و سەرلەنوێ وەکو هەویر هەڵیانشێلایەوە و پەیتا پەیتا نایان لەو شوێنانەی

دەست و قاچم کە بە زەبری لێدان بە کێبڵ هەڵئاوسابوون.

لەڕاستییدا ئەم گرنگیپێدان و بەتەنگەوەهاتنەم زۆر پێ خۆش بوو چونکە هەستی ئەوەی لا دروست کردم کە لە ناو ماڵ و منداڵ و کەس و کاری خۆمدام. ئەگەرچی ئێش و ئازارم زۆر بوو و هەموو ئازای ئەندامم ژانی ئەکرد، بەڵام پاڵم دابوو بە دیوارەکەوە و بەمەبەستی ورەبەرزکردنەوەی هاوڕێکانم وتم: ئا ئەو دۆمینەیە بهێنن با دوو دەست دۆمینە بکەین. پێشتر لە پاکەتی جگەرەی سۆمەر پولەکانی دۆمینەمان دروستکردبوو. پاش بەینێک و لەدوای ئەوەی کە لەشم ساردبووەوە هێشتا هەر حەزم دەکرد کە ببوورێمەوە تاکو بۆ ساتێک ئەو ئێش و ئازارە زۆرەی کە هەمبوو لە بیرم بچنەوە، کتوپڕ لە تاو ئازاری سووتانەوەی ئەو شوین و جێی هەڵتۆقینانە کە لە دەست و قاچمدا بوون و ناوکی سەموونەکەیان بۆ لێنابووم، هاوارم کرد قاچ و دەستم سووتا! کاتێک کە هەویریان لە دەست و قاچم کردەوە هەویر بەهۆی ئەوەی کە خوێی تێدا بوو شوێنی هەڵئاوسان و تلۆقی قاچ و دەستمیان سووتاندبووەوە.

لەدوای ئەوە داوایانلێکردم بۆ خۆم پشوو بدەم و ڕابکشێم. لە سەر جێگەکەم ڕاکشام بەڵام تا بەرەبەیان هەر تلامەوە و گینگڵمدا و خەو نەچووە چاوم. یەک دوو جارێکیش تەنگاو بووم، میزم هات، چووم لە سەر ئەو تەنەکەیە کە لە ژوورەکەماندا بۆ خۆخاڵییکردنەوە دانرابوو، هەڵمیزام، تەماشام کرد ڕەنگی میزەکەم لەبری ئەوەی کە زەرد و ئاسایی بێت، یەکپارچە سوور و هەمووی خوێن بوو. لەدوای ئەم دوو جار ئەشکەنجەدانەوە بەتەواویی و بەئاشکرا هەستم بە کپبوون

و قورسبوونی گوێچکەکانم و تێکچوونی بینین و چاوم کرد. لە سەروەختی ئەشکەنجەداندا هەرچەند هاوارم بە سەر جەللادەکانمدا دەکرد: کەڕبووم، کوێربووم، بەڵام جەللادەکان نەک هەر نەیاندەبیست بەڵکو جوێنیان پێدەدام و شۆخییان پێ دەکردم و دەیانوت (شیگول هذا الگواد) واتە: ئەو گەوادە دەڵێ چی؟ مرۆڤ بوونەوەرێکە تا ڕادەی سەرسوڕمان چاونەترس و بوێرە، دەنا چۆن هەوڵدەدات لەگەڵ بارودۆخی ئاوەهادا هەڵبکات و بەرگریی بکات تاکو نەمرێت و بە زیندوویی بمێنێتەوە!؟

## حیزبی شیوعی لە نێوان دوو ئەزیز(عەزیز)دا

دەستەوسانیی حیزبی شیوعی عێراق لە سایەی سەرکردایەتیی عەزیز محەمەد-دا لە ڕووبەڕووبوونەوەی فاشیستەکان کە لە ساڵی١٩٦٣دا لە بەغدا دەسەڵاتیان گرتە دەست، هۆکاری ڕاستەوخۆی بڕێک کەرتبوون و جیابوونەوە بوو کە لە ساڵی ١٩٦٤ بەدواوە لە ناو حیزبدا ڕوویاندا تا لە مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٦٧دا یەکێک لە گەورەترین ئەو کەرتبوونانە ڕوویدا کە بە جیابوونەوەکەی عەزیز حاج یاخود قیادە مەرکەزیی ناوی چووەتە ناو مێژووەوە. ئەو سەردەمە لە زۆربەی دەوڵەتانی جیهانی سێیەمدا باو باوی شۆڕشی پارتیزانیی و خەبات و ڕووبەڕووبوونەوەی چەکداریی دژ بە ڕژێمە بەکرێگیراو و دیکتاتۆرییەکان بوو.

لەکاتی جیابوونەوەکەی عەزیز حاج-دا محەلیی سلێمانیی حیزبی شیوعی تاک و تەرایان لەگەڵ حیزبەکەی عەزیز محەمەد-د مانەوە و سەرجەمیان لەگەڵ حیزبەکەی عەزیز

حاج-دا ڕۆیشتن. ئەوکات ساڵح عەسکەریی ئامۆزای عەلی عەسکەریی لێپرسراوی محەلیی سلێمانی حیزب بوو. من بۆ خۆم یەکێک بووم لەو ئەندامانە کە لەگەڵ باڵەکەی عەزیز حاج-دا ڕۆیشتم و حیزبم بەجێهێشت.

بەڵامساڵی برد و نەبرد قیادە مەرکەزییەکەی عەزیز حاج لە سلێمانی تووشی جیابوونەوەیەکی تر هات و بوو بە دوو باڵەوە، باڵی شێخ عەلی نائیب زابت و باڵی موسڵیح مستەفا جەلالی. من لە سەرەتادا لەگەڵ باڵەکەی شێخ عەلی ڕۆیشتم کە باڵی زۆرینەیش بوو، بەڵام من و زۆر کەسانی تریش باڵەکەی شێخ عەلیمان جێهێشت و چووینە لای موسڵیح. هەم باڵەکەی موسڵیح و هەم باڵەکەی شێخ عەلی لە سەرەتادا شاری سلێمانییان کردبوو بە بنکە و بارەگا بۆ کار و چالاکییەکانیان، بەڵام لەدواییدا باڵەکەی موسڵیح هەواریان بەرەو قەرەداغ و گوندی دەرەویان و مزگەوتی گوندەکە گواستەوە و باڵەکەی شێخ عەلی-یش بەرەو هەولێر و ناوچەی پردێ باریانکرد. بە کاریگەریی بزووتنەوە چەپ و شۆڕشگێڕییەکانی ئەو سەردەم و ڕۆژگارە و ئایاری ١٩٦٨ی فەڕەنسا و کوژرانی گیڤارا و زۆر ڕووداوی شۆڕشگێڕیی ئەو ڕۆژگارە و جووڵانەوە ماوییەکانی ئەو سەردەمە، باڵەکەی موسڵیح و باڵەکەی شێخ عەلی ڕۆژانە بەڵێنی بەرپاکردنی شۆڕشی سەرتاسەرییان لە عێراق بە خەڵکی عێراق دەدا، موسڵیح وای نیشان دەدا کە لە یەکی مانگی ئایاری ١٩٦٩ لە دەرەویان-ەوە بەرەو باقوبە دەکشێت و بە شۆڕشێک بەغدا و دەسەڵاتی بەعس ڕادەماڵێت، بەڵام سەرەنجام بەرەو باوان بووەوە و گەڕایەوە بەغدا و بوو بە پیاوی بەعس و

باڵەکەی شێخ عەلی-یش لە ژێر زەبری ستەمی دەسەڵاتی سەرکوتکەری بەعسدا یان ئەندامەکانیان لەسێدارەدران یاخود کۆڵیان لە سیاسەت دا و چوونەوە ماڵەوە دانیشتن.

ڕۆژگارێک کە موسڵیح و ئەحمەد مەحمودی دەلاک و فایەق دەرەویانی و ساڵح عەسکەری لە حیزبێکدا هاوڕێی تێکۆشان بوون، لەدواییدا موسڵیح بوو بە ئەندامی ئەو دادگایەی کە فایەق دەرەویانی و ساڵح عەسکەری و ئەحمەد مەحمودی دەلاکی لەسێدارەدا و لەدواییدا خۆیشی چووە باوەشی بەعس، وەک چۆن عەزیز حاج-یش تۆبەی کرد و چووە ئامێزی بەعس و بەعسیش بەوە خەڵاتیان کرد کە کردیان بە نوێنەری عێراق لە ڕێکخراوی یۆنسکۆ.

باڵەکەی عەزیز محەمەد-یش کە باڵە سۆڤیەتییەکە بوو، بە هاندانی سۆڤیەت و بەدەر لە خواستی زۆربەی ئەندامانی حیزب لەو کاتەدا، لەگەڵ بەعس-دا چووە بەرەیەکی سیاسییەوە کە بێجگە لە بەعس و سۆڤیەت هیچ لایەنێکی تر سوودی لێ نەبینی. بەعس بەو بەرەیە لەسەر ئاستی ناوخۆ خۆی بەهێز و قایم کرد و لەسەر ئاستی دەرەکیی وەک ڕژێمێکی سۆشیالیستیی و پێشکەوتنخواز خۆی نیشانی جیهان دا و سۆڤیەتیش عێراقی بۆ بوو بە بازاڕ بۆ ساغکردنەوەی کاڵا و شمەکەکانی.

ئەو ئەندامانەی حیزبی شیوعی کە لەگەڵ باڵەکەی عەزیز حاج ڕۆیشتن و لەدواییدا بەعس لەسێدارەیدان یاخود لە گەرمەی تێکۆشانی سیاسیدا تیاچوون و فەوتان، لای حیزبی شیوعی تا ئێستایش نەک هەر بە شیوعی تەماشاناکرێن بەڵکو لە کولەکەی تەڕیشدا ناویان ناهێنرێت! هەندێک لە شیوعییە عەرەبەکانی

عێراق بڕوایان وایە سەرکردایەتیی کوردیی حیزبی شیوعی عێراق هەم هۆکاری دەست بە دەسەڵاتی سیاسیی ڕانەگەیشتنی حیزبی شیوعییە لە عێراق و هەمیش ئۆباڵی ئەو لاوازبوونەی لە ئەستۆیە کە دەیەها ساڵە بزووتنەوەی کۆمۆنیزم لە عێراقدا بە دەستییەوە دەناڵێت.

سەرەڕای بوونی دوو ئەزیزی دەستڕۆیشتوو لە ناو حیزبی شیوعییدا، بەڵام حیزبی شیوعی و شیوعییەت لە عێراقدا لە بێئەزیزییدا سەرینایەوە.

## ئێوە لەکوێ ژن مارە دەبڕن؟

مانگی دوانزەی ساڵی١٩٨٩ بوو، نزیکەی حەوت مانگ بوو دەستگیرکرابووم، ئەو کاتە لە ئەمنی تکریت زیندانیی بووم، ڕۆژێکیان دوو زەلامی خەڵکی سلێمانییان هێنایە ئەو شوێنەی کە منی لێ بەندکرابووم، شێخ حەسەن و برادەرەکەی، لەدواییدا دەرکەوت کە شێخ حەسەن خزمی شێخ عەزیز بازیانیی-ە و لەو کاتەیشدا باس لەوە دەکرا کە شێخ عەزیز مەفرەزەیەکی تایبەتی هەیە لای حاجی عەباس-ی بەڕێوەبەری ئەمنی عامی ئەوسا کە هاوکات مامی سەدام-یش بوو. ئەم دوو زەلامە لە سەر پرسی قاچاخچێتی و بازرگانی لەگەڵ ئێران دەستگیرکرابوون. ئەم شێخ حەسەن-ە زیاد لە جارێک پێیوتم حەز دەکەم چەند پرسیارێکت لێبکەم، بەڵام هیوادارم کە توڕە و دڵگران نەبیت لێم. منیش هەموو جار دەموت: بەسەرچاو، هەموو کات ئامادەم گوێت لێبگرم و نە توڕە دەبم و نە پێویستیش بە دڵگرانبوون دەکات. دواجار ڕۆژێکیان دەرفەت ڕەخسا و شێخ پرسیارەکانی

کرد، وتی: ئێوە وەکو کەسانێکی شیوعی، لە کوێ ژن مارە دەبڕن، کاتێک کە ژن دەهێنن؟ منیش وەڵاممدایەوە و وتم: وەک هەر کەسێکی تری کۆمەڵ، لە دادگا و لای مەلا و پیاوانی ئایینیی مارەی دەبڕین. ئینجا شێخ پرسی: ئەی ڕاستە کە ئێوە لەگەڵ دایک و خوشکی خۆتان دەخەون؟! منیش وتم: ئەی مەگەر دایک و خوشکی ئێوەمان بۆچییە؟

## خزمەتی سەربازیی

لە ١٩ی مانگی ئەیلولی ساڵی١٩٥٣دا بووم بە سەرباز و لە ١٤ی مانگی ئایاری ساڵی١٩٥٦دا ماوەی خزمەتی سەربازیم تەواوکرد. ئەوکات ماوەی خزمەتی سەربازیی لە سەر هەموو عێراقییەک ئەرک بوو. دەبوو هەموو هاوولاتییەک (نێرینە) لە ڕێگای بوون بە سەربازی سوپای وڵاتەکەیەوە ماوەی دوو ساڵ خزمەتی نیشتمانەکەی بکات.

## یەکەمین کاری نەقاڕیم

یەکەمین شوێن کە ئیشی نەقاڕیم تێدا کرد لە ساڵی١٩٥٦ و لەدوای تەواوکردنی خزمەتی سەربازیم، مزگەوتی عەبدوڵڵا لوتفی بوو لە گەڕەکی چوارباخ، کە لە چوارچێوەی ئیش و پرۆژەکانی حکومەتدا بوو. ڕوو و چواردەوری دیواری باڵەخانەی مزگەوتەکە کە بە بەرد دروستکراوە، من بەردەکانیم تاشیوە یاخود نەقاڕیی کردووە. لەو کاتەیشدا وەک کرێکاری نەقاڕ لای ئەم وەستایانە ئیشم دەکرد: ئەحمەد مەعروف بەنا کە خەڵکی سابوونکەران بوو و ماڵیان لەولای ماڵی سۆفی کەریم-

ەوە بوو و بە تەمەن لە هەموو وەستاکان گەورەتر بوو. محەمەد فەیزوڵڵا کە ماڵیان لە چوارباخ و هەر لە ڕیزی مزگەوتەکەدا بوو. حەمەعەلی ناسراو بە برای سەعەی شیو کانێسکانی. عەبدوڵڵا عەزیز ئیسماعیل، ناسراو بە عەبەی عەزیز. ڕۆژانەکەیشم دینارێک بوو، بە بەراورد بە ڕۆژانەی کرێکارێک کە ڕوبعێک و شەش پەنجایی بوو، زۆر بوو، بەڵام کارەکەی ئێمە کە تاشینی بەرد بوو، کارێک بوو زیاتر لە وەستاییەوە نزیک بوو وەک لە کرێکاریی. ئەمانەیش ناوی هەندێک لەو باڵەخانە و خانووانەن کە من بەردم بۆ دروستکردنیان نەقارپییکردووە یاخود تاشیوە: قوتابخانەیەک لە ڕۆژهەڵاتی بەندیخانەی سەرەوە، قوتابخانەیەک لە گەڕەکی گۆیژە لە ڕووی قوتابخانەی ئێستای ڕۆژهەڵاتی کوڕان، نەخۆشخانە و قوتابخانەیەک لە عەربەت، شەست خانوو لە گەڕەکی عەقاری کە بۆ سوپا دروست دەکران، چواردە خانوو بەرانبەر بە ئەم شەست خانووە کە بۆ نائیب زابتەکانی سوپا دروست دەکران، ماڵی عەقید ئەمین-ی ئامر حامییەی سلێمانی، ماڵی شێخەی نوقوڵ کە دووکانەکەی لە ڕیزی کتێبخانەی گەلاوێژ بوو لە شەقامی مەولەوی.

## داوایان لێ کردم جوێن بە بارزانی بدەم

مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی١٩٦٢و، کاتژمێرێکی درەنگانی نیوەشەو بوو، بێجگە لە دەنگی بارانی بە خوڕ و چەخماخە هیچی تر نەدەبیسترا، شەوێکی تاریکی زستانی پڕ تۆف و ڕەهێڵە و باران بوو. ئا لەم کاتەدا زرم زرم بە بۆکس و شەق لە دەرگای ماڵەکەمان درا کە لە گەڕەکی خەبات و لە هۆدە و هەیوانێکی

ماڵی باوکمدا دەژیام و ساڵانێک بوو خێزانم پێکەوەنابوو و خاوەنی دوو مناڵ بووم.

لە خەوێکی شیرین و قووڵدا بووم لە دەنگی زرم و هوڕی دەرگا بەئاگاهاتمەوە. ئاخۆ چی بووبێت و کێ بێت بەم شەوە درەنگە و بەم تۆف و بارانە ئەوەندە بەپەلە و تەنگەتاوە بەو جۆرە لە دەرگا دەدات؟! خێرا لە ناو جێگەکەم هاتمەدەرەوە و هەستام و دەرگای هۆدەی سەر هەیوانەکەمان کردەوە و پێڵاوم کردە سەر پێم و بەرەو دەرگای حەوشە ڕۆیشتم و بە دەم ڕۆیشتنیشمەوە بۆ ئەوەی کەسی لەدەرگادەر بڕێک ئارام بگرێت و پەلە نەکات هاوارم دەکرد: وا هاتم، وا هاتم.

کاتێک کە دەرگام کردەوە مۆتەکەم بینی! ژمارەیەکی زۆر سەرباز و ئینزیباتی عەسکەریی بە پڕتاو خۆیان کرد بە حەوشەکەدا و هاتنە حەوشەی ماڵی باوکمەوە. هەر لە هەوەڵەوە دیاربوو کە کەسێک هەواڵی لێداوین، چونکە لەگەڵ دەرگام کردەوە هێند بە وروژم خۆیان کرد بە ژووردا ئەگەر خۆم لە سەر ڕێیان لانەدایە دەبووم بە ژێر دەست و پێیانەوە. بەڵام هەرچۆنێک بوو پێشیانکەوتم و بەرەو ئەو هۆدە و هەیوانە ڕێنوێنیم کردن کە خۆم و ماڵ و مناڵمی تێدا دەژیاین.

بەجارێک دە تا دوانزە ئینزیباتی عەسکەریی بە پۆستاڵی قوڕاویی و بەرگی باراناوییانەوە خۆیان کرد بە ماڵەکەمدا. هەر لەگەڵ هاتنە ژوورەوە وێنەیەکی فازڵ عەباس مەهداوی سەرۆکی دادگای گەل و خزمی عەبدولکەریم قاسم سەرنجی ڕاکێشان کە بە قەد دیواری هۆدە تاقانەکەمانەوە و لەتەنیشت وێنەکەی عەبدولکەریم قاسمەوە هەڵمواسیبوو. یەکەمین ئینزیبات

که هاته هۆدەکەوە و چاوی بە وێنەکە کەوت، دەسبەجێ بە دەنگێکی بەرز بانگی لە ئامر ئینزیباتەکەی کرد کە لە هەیوانەکە بوو: گەورەم گەورەم، وەرە ژوورەوە بڕوانە خاوەن ماڵ چی هەڵواسیوە! ئامر ئینزیبات کە ئەفسەرێکی دوو ئەستێرە بوو و بە فەساڵ و شێوە مرۆڤێکی ڕەشکەلانەی بالابەرز بوو و ناوی قاسم مەهداوی بوو، بە تووڕەییەوە وتی: بۆچی وێنەی مەهداویت هەڵواسیوە؟! وتم: چونکە خزمی زەعیمە. بێ سێ و دوو مشتەکۆڵەیەکی کێشا بە دەممدا و دەممی پڕ کرد لە خوێن.

ئینجا لای منیان بەجێهێشت و چوون ماڵی عەبدولڕەحمان و ماڵی ئەحمەدی برام و ماڵی باوکمیان خەبەرکردەوە و وتیان: ئێمە لەگەڵ حکومەتین و حکومەتمان خۆش دەوێت، داواتان لێ دەکەین کە جناو بدەن بە بارزانی! ئەوان، عەبدولڕەحمان و ئەحمەدی برام، جوێنی خۆیان دا، ئینجا بە منیان وت: جوێن بدە بە بارزانی، وتم بۆچی جوێنی پێ بدەم، جوێن بە کەس نادەم! وتیان: کەواتە خۆت کۆبکەرەوە لەگەڵ خۆماندا دەتبەین. خۆم کۆکردەوە، جزمەم لە پێ کرد، پاڵتاوێکی چاکم هەبوو کردمە بەرم. هەردوو دەستمیان لەپاشەوە بەستم و لەگەڵ خۆیاندا ڕاپێچی کۆلانیان کردم. چ قورەت بوو کەسێک لە خاو و خێزان و ماڵی باوک و براکانم بوێرن ورتەیەک یان فرتەیەک بکەن!

لە کۆڵان بردیانمە پاڵ ستوونی کارەباکەوە و پێیانوتم: لێرەدا بووەستە. ئەو کابرایەی کە ئەم سەرباز و ئێزیباتانەی هێنابووە سەرم بۆ ماڵەوە، لەو کاتەدا ئەویش لە بەر ماڵەکەماندا ڕاوەستابوو و هاتە لامەوە و وتی: پێت دەڵێن جوێن بە بارزانی بدە، بۆچی جوێن نادەیت، لەبەرچی خۆت تووشی کێشە

دەکەیت؟! کاتێک کە پێیانوتیت جوێن بە هەر کەسێک بدە، جوێنی خۆت بدە و تەواو. منیش وتم: کاکە گیان ئەو کەسەی کە تۆ پێم دەڵێیت جوێنی پێبدە من نەدەیناسم و نە کێشەم هەیە لەگەڵی، ئیتر چۆن و بۆچی جوێنی پێبدەم؟! لێرەدا ئامر ئینزیباتەکە و ئینزیبات و سەربازەکان لەوبەر ماڵی باوکمەوە ڕاوەستابوون و وادیاربوو گوێیان لە قسەکانی من و ئەو کابرا کوردە دەگرت کە تا ئەو کاتە نەمدەزانی لەگەڵ ئەم سەربازانەدا چ کارەیە و بۆچی هاتووە. ئامر ئیزیباتەکە بانگی لە هەردووکمان کرد: وەرن بۆ ئێرە. بیرم کردەوە ئەم کابرا کوردە کە لەگەڵ ئەم سەربازانەدا هاتووە کەسێکی نامۆ نییە هەست دەکەم کە پێشتر بینیومە! کێیە، کێیە؟ ئەها، ئەمە ناوی ڕەشە چغە-یە، شۆفێری ئۆتۆمبێلێکی پیکابی ڕێگای قەرەداغە. کاتێک کە بانگیان کردینە لای خۆیان، ڕووی دەمیان کردە ڕەشە چغە و پێیان وت: ئەم زەلامە ئەوە یاخود ئەو نییە؟ ڕەشە چغە بە عەرەبی لەگەڵیان دەدوا و دەیوت: ئەوە و ئەو نییە. ئامر ئینزیباتەکەیش پەلاماری ڕەشە چغەی دا و بە شەپازلە بەربووە سەر و گوێلاکی ڕەشە و پێیوت: سەگی کوڕی سەگ، ئەوە و ئەو نییە یانی چی؟! ئەگەر ئەوە بڵێ ئەوە، ئەگەر ئەویش نییە بڵێ ئەو نییە. ئینجا ڕەشە چغەیان ئیزندا و پێیان وت بڕۆ. پاشان ئامر ئینزیباتەکە لەگەڵ دوو نائیب زابت کە لەگەڵیاندا بوون هەروەها لەگەڵ عەریفێکی سوپا کە کوردی خانەقینی بوو و ناوی عەریف حەمید بوو، وتیان یاڵڵا پێشمان بکەوە!

بەرەو لای ڕۆژهەڵاتی ماڵی باوکم و ڕووەو خوار بۆ پشت مزگەوتی چاڵەکە کە یەکەمین مزگەوت بوو لە گەڕەکەکەماندا،

لەگەڵ خۆیاندا بردیانم. لە سەر ڕێگاکە و لە پێشمانەوە دووکانێک هەبوو، هەڵبەتە بەو شەوە درەنگە داخرابوو، دووکانی کابرایەک بوو سالەی سیمە-یان پێ دەوت. دووکانەکەی پڕی بوو لە شەکر و چا و ڕۆن و برنج و خۆراک، دەرکی دووکانەکەیان شکاند و ئۆتۆمبێلیان نا بە دووکانەکەوە و خۆراک و ئازوقەیان بارکرد و بردیان! لەو کاتەیشدا کە ساڵێک دەبوو کورد لە حکومەتی قاسم یاخی بوو بوو و قاسمیش لە ناردنی ئازوقە و خۆراک بۆ کوردستان دەستی گرتبووەوە، لەوبەر دووکانەکەوە لەسەر کۆڵانەکە گڵۆپی پەنجەرەی ماڵی بەرانبەر داگیرسابوو، بەپەلە بەرەو ڕووناکیی پەنجەرەکە ڕایانکرد و لە بەر پەنجەرەکە کۆبوونەوە و تەماشایانکرد و بە وردیی گوێیان هەڵخست، گوێیان لە ورتە ورتێک بوو، کاتێک چاودێرییان کرد بۆیان دەرکەوت کە قوتابییە و بەو شەوە درەنگە خەریکی سەعیکردنە. ئینجا بەرەو ژوور بۆ لای ماڵی حەمە شارەزووریی کە پاسەوانی نەخۆشخانە بوو و جەمال-ی کوڕیشی ئەندامی حیزبی شیوعی بوو، سەرکەوتن. لەم کاتەدا هەناسەم سوار بوو و لێدانی دڵم ڕووی لە زیادبوون کرد، چونکە ترسام کە هەڵبکوتنە سەر ماڵی حەمە شارەزووریی و ماڵی حەمەیش کاتێک کە من دەبینن لەگەڵ ئینزیبات و سەربازەکان وادەزانن عەلی حامید هەواڵی لێداون و سەربازانی هێناوەتە سەریان! بەڵام بەوەی باش بوو سەربازەکان نە چوونە سەر ماڵی حەمە و نە سەر ماڵی کەسی تر، بەڵکو کەمێک لەولاترەوە لە دەشتاییەکەدا لایاندا و ڕاوەستان. هەموویان لە دەوری عەریف حەمید کە کورد بوو کۆبوونەوە و کەمێک پێکەوە قسەیان کرد، ئینجا عەریف

حەمید و سەرباز و ئیزیباتەکان بەرەو لای من هاتن کە لەولای خۆیانەوە داوایانلێکردبووم ڕابووەستم و وتیان: یاڵڵا دەی جوێن بدە بە بارزانی! منیش وتم: من بارزانی ناناسم و نازانم کێیە. لەگەڵ وام وت بە جارێ هەموویان بە شەق و مشتەکۆڵە و کێبڵ کەوتنە وێزەم و لەو بەر بارانە لە ناو قوڕ و لیتەی ئەو دەشتەیان گەوزاندم، ئینجا هەڵیانستاندمەوە و وتیان یاڵڵا هەڵبێ! ڕاستییەکەی منیش زۆر ترسام، چونکە پێموابوو کە دەیانەوێت لە دواوە گولەبارانم بکەن و بمکوژن و دواتر بڵێن لە دەستمان هەڵهات بۆیە تەقەمان لێکرد و کوشتمان! بەڵام لە ڕاکردنیش زیاتر هیچ چارێکی ترم نەبوو بۆ دووکەوتنەوە لێیان و دەرچوون لە دەستیان. ئەوەبوو بە گوێیانم کرد و ڕووەو خوار بەرەو لای دووکانەکەی سالەی سیمە کە تالانیان کرد هەڵهاتم و خۆم دایە پاڵ دووکانەکە. باش بوو لەدواوە تەقەیان لێ نەکردم. پێدەچوو نیازیان نەبووبێت کە بمکوژن.

هەرچۆنێک بوو لە تەنگوچەڵەمە و چورتمێکی تری ژیان ڕزگارم بوو. پاش ئەوەی کە ئەوانیش پشتیان لێ وەرگێڕام و بەرەو سەر ڕۆیشتن، منیش لە دووکانەکە کە پەنام پێ دابوو دوورکەوتمەوە و بە ڕاکردن بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە. کاتێک کە لە دەرگام دا خاو و خێزان و دایک و باوک و برا هەموو لەودیو دەرگاکەوە ڕاوەستابوون و دەگریان و شیوەنیان دەکرد. کەس و کار کاتێک کە منیان بینی، ئەگەرچی پەنجەیەکم کە کێبڵی بەرکەوتبوو و خوێنی لێ دەچۆڕا و سەرم لە سێ لاوە شکابوو و خوێنی پێدا دەهاتە خوارەوە و لە قوڕ و لیتاودا گەوزێنرابووم، بەڵام ئاهی شادییان بە بەردا هاتەوە و ڕوویان گەشایەوە و لە خۆشییاندا پێیان ئەرزی

نەدەگرت کە بە زیندوویی گەڕامەوە ناویان. پاش ئەوەی کە چوومەوە ناو خاو و خێزان و دڵتەنگیی کەس و کار ڕەوییەوە و خۆم لە قوڕ و لیتاو پاک کردەوە و برینەکانم سارێژ کرد، وردە وردە هۆکاری ئەو هەڵکوتانە کتوپڕەی سەربازان و ئینزیباتی سەربازیی بەو شەوە درەنگە بۆ سەر ماڵەکەمانمان بۆ ڕوونبووەوە. ڕەشە چغە-ی شۆفێری ڕێگای قەرەداغ کە ئەویش ماڵیان لەو دەوروبەرە بوو لە گەڕەکی خەبات، سەربازەکان چوونەتە ماڵەوە بۆ لای و داوایانلێکردووە کێ دەناسێت کە پێشمەرگەیە لە قەرەداغ و ماڵی کەس و کاری لە گەڕەکی خەباتە نیشانیان بدات، ئەویش لەبری ئەوەی ماڵی حەمەی ڕۆن-یان نیشانبدات کە ماڵەکەیان بەرانبەر بە ماڵی باوکم بوو و عەلی برای پێشمەرگە بوو لە قەرەداغ، هاتبوو ماڵی ئێمەی نیشاندابوون. وادیاربوو ڕەشە چغە بەو نیازە هاتبوو لەگەڵیان ماڵی حەمەی ڕۆنیان نیشانبدات بەڵام لە ڕێگا بیری کردبووەوە کە ئەگەر ئەو کارە بکات لەکاتێکدا کە شۆفێرە لە ڕێگای قەرەداغ، سبەینێ عەلی برای حەمە کە پێشمەرگەیە لە قەرەداغ هەر زوو لە ڕێگای قەرەداغ دەیگرێت و لە تۆڵەی ئەو کارەدا دەیکوژێت، هەر بۆیە ڕەشە چغە لەبری ماڵی حەمەی ڕۆن ماڵی ئێمەی نیشانی سەربازەکاندا.

## خەڵاتی بارزانی

سەرەڕای ئەوەی کە پارتی و بارزانی لەدوای کودەتای هەشتی شوباتی١٩٦٣ ئەو شیوعییانەی لە تەویلەدا جێ دەکردەوە کە لە تاو تیرۆر و گرتن و ڕاوەدوونان لە بەغدا و ناوچەکانی خوارووی عێراقەوە بەرەو هەولێر هەڵدەهاتن،

وێڕای ئـەوەی کە لە دەهـەی شەستەکان لە سلێمانی و بە فەرمانی بـارزانـی و لەژێر سـەرپەرشتیی عەگید سدیق-ی نوێنـەری بـارزانـی-دا لـە سلێمانی کانیی ماسـی و کانیی ساردی بۆ قڕکردنی شیوعییەکان دانرابوو و دەیان کادری پێشکەوتوو و چالاکی ئەو حیزبە تیرۆرکران، سەرباری ئەوەی کە لە دەهەی حەفتاکان و لەلایەن عیسا سوار-ی فەرماندەی پارتییەوە لە زاخـۆ سیانزە کـادری ئـەو حیزبە ڕفێنران و تیرۆرکران و لە زیندانی بەدناوی ڕایات زۆر کادری شیوعی لەناوبران و تیرۆری شیوعییەکان لە سەر شەقام و جادەکان لە سلێمانی درێـژەی هەبوو و ئـەو ئیرهابەی کە پارتی لە دەهەی حەفتاکان بەرانبەر بە حیزبی شیوعی پەیڕەوی کرد هیچی لەو ئیرهابە کەمتر نەبوو کە عەبدولسەلام عـارف و بەعس و قەومییەکان لە١٩٦٣ بەرانبەری گرتیانەبەر و من خۆم لەو خانووەی کارگێڕیی خۆجێیەتی کە لە گەڕەکی گۆیژە تێیدا بووم شەو نەبوو لەلایەنماڵی حاجی فەرەج و کوڕەکانییەوە ماڵەکەمان بەردباران نەکرێت و پەلامار نەدرێین، ئەحمەدی برایشم لە هەوڵێکی کوشتندا لە مەرگ گەڕایەوە کە لەتیف-ی کوڕی حاجی فەرەج لەساڵی ١٩٧٤ ئەنجامی دا و لە کاتێکدا کە پارتی بۆ خۆی ڕەوا بوو کەی و چۆن بیەوێت لەگەڵ بەعس ڕێبکەوێت، بەڵام بەرەی بەعس و شیوعییان بە جاشایەتیی لە سـەر حیزبی شیوعی کردبوو بە ماڵ، بەڵام عەزیز محەمەد، کە سی ساڵی ڕەبەق سکرتێری حیزبی شیوعی عێراق بوو و بەشێک لە بەرپرسیارێتیی جیابوونەوەکەی عەزیز حاج-یشی لە ئەستۆدایە، بێجگە لـەوەی کە بەرپرسیاری سەرەکییە لە

سڕکردن و خەواندن و پاشان مردارکردنەوەی جووڵانەوەی شیوعییەت لە عێراقدا، لە ساڵی ٢٠١٥دا بەوپەڕی شانازییەوە خەڵاتی بارزانی وەرگرت و بە بەرۆکییەوە هەڵیواسی!

دەوترێت کە لە سیاسەتدا ئەستەم نییە، بەڵام هاوکات سیاسەت هونەری کردنی ئەو کارانەن کە لە توانای کردندان، یەکێک لەو کارانەیش کە لە توانای کردندا نەبوو چونکە کردنی هەڵە بوو و لەسەر ناو و ناوبانگ دەکەوت، ئەو کارە بوو کە عەزیز محەمەد بە وەرگرتنی خەڵاتی بارزانی کردی.

## تیرۆرکردن لە سەر کار

وەک لە چەند شوێن و جێیەکی تریشدا باسم کردووە، ساڵانی شەست ساڵانێک بوو کە هەم دەزگای ئەمن و هەواڵگریی حکومەتەکانی بەعس و عەبدولسەلام عارف و ئەوڕەحمانی برای و پاشان جارێکی تر بەعس و ئینجا مەلایی و جەلالی بە جیا و پاشان هەموویان پێکەوە و بە هاوکاریی و هاوبەشیی، لە ڕێگای تیرۆری کانیی ماسی و کانیی ساردییەوە، دەرگای دۆزەخیان بە ڕووی حیزبی شیوعی لە سلێمانیدا خستبووە سەر پشت. لە دەهەی شەستدا لە گەڕەکی مەڵکەندی دوو برا هەبوون بە ناوەکانی ساڵح میرزا و عەبدوڵڵا میرزا لایەنگر و هەواداری حیزبی شیوعی بوون و نانەواخانەیان هەبوو، ڕۆژێکیان لە کاتێکدا کە لە نانەواخانەکەدا سەرقاڵی ئیش و کاسپیی نانەواچێتییەکەیان بوون، کانیی ساردییەکان چوونە سەریان بۆ نانەواخانەکە و هەردووکیان لە ناو نانەواخانەکەدا تیرۆرکردن.

لەو کاتەدا مەلا حەسەن کە خەڵکی دەوری هەولێر بوو و ناوی خۆی فەتاح تۆفیق بوو، لێپرسراوی سلێمانی بوو، گێڕایەوە و وتی: لەدوای ئەو ڕووداوە لەگەڵ مام جەلال دانیشتین و پێمانوت ئەگەر کار وا بڕوات و تیرۆر و تۆقاندنی ئەندام و لایەنگرانمان لە سلێمانی درێژە بکێشێت، خەباتی شیوعییەکان کە دژ بە دەسەڵاتی دیکتاتۆریی عێراقن پەکدەخات و ئاراستە و ڕێڕەوی خەباتیان دەگۆڕێت و ئەمەیش زیانی گەورەی بۆ سەر جووڵانەوەی نیشتمانیی عێراق و تەنانەت بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیش دەبێت. مام جەلالیش بەڵێنی دابوو کە هەرچی زووە کۆتایی بەو کێشەیە بهێنێت و کانیی ساردییەکان لە سلێمانی دووربخەنەوە و ڕەوانەی گەرمیانیان بکەن، بەڵام بەڵێنەکەی هەر بە قسە مایەوە و نەیبردە سەر.

## نوێنەرمان لە یەکێتیی قوتابیان

ساڵانی ١٩٦٠ و١٩٦١ حەزم کرد بچمەوە قوتابخانە و خوێندن، کە بە هۆی دەستکورتیی خێزانەکەمان و کرێکارییەوە بەجێمهێشتبوو، دەستپێبکەمەوە، هەر بۆیە چوومەوە بەر خوێندن و چوومە قوتابخانەی گۆیژە کە باڵەخانەکەی کەوتبووە ڕۆژئاوای بازاڕی عەسری ئێستا. لەو کاتەدا شەوان دەچووم بۆ خوێندن بۆ قوتابخانە، ئەوەی کە ئێستا پێی دەڵێن قوتابخانە یاخود خوێندنی ئێواران. هەڵبەتە خوێندنەکەم لە قوتابخانەی گۆیژە بەخۆڕایی، واتە بەبێ پارە نەبوو، بەڵکو ساڵانە ١٢ دینارم دەدا. سەرەتای ساڵ ٦دینار، نیوەی ساڵ

٦ دینارەکەی ترم دەدا. لەو ڕۆژگار و سەردەمەدا بارودۆخە سیاسییەکە بەگشتیی و لایەنی زۆر بە ئاراستەی کوردایەتی و پارتایەتیدا بوو. ڕۆژێکیان لە قوتابخانە هەڵبژاردنی یەکێتیی قوتابیانمان کرد، نوێنەرێکمان بۆ خۆمان هەڵبژارد. عومەر عەزیز-ی برای عەبەی عەزە شان شکاو-مان هەڵبژارد. لەو کاتەدا عەلی حەلاو-ی نووسەری مەعاریف کە دەکاتە پەروەردەی ئێستا، لە کارگێڕیی مەعاریف بوو، من داوامکرد وەک کارئاسانیکردن و باری سەر شان سووککردن بۆ قوتابییەکان، بۆ هەقی خوێندنی ئەو ساڵە ٦دینارەکەی نیوەی ساڵمان لێ وەرنەگرن و لە سەندنی پارەیە بمانبەخشن. مەعاریفیش چوون پرسیان بە نوێنەرەکەمان کرد کە هەڵمانبژاردبوو و وەک وتم عومەری عەزە شان شکاو بوو. هەڵبەتە من لەگەڵ عومەردا یەکترمان زۆر باش دەناسی و هاوڕێ و برادەر بووین، سەرباری ئەوەی کە من لەلایەکی ترەوە لەگەڵ عەبەی برای ڕۆژیی بە دینارێک ئیشی نەقاڕییم دەکرد. ئیتر ئەوە بوو عومەر وەڵامی مەعاریفی دایەوە و وتی نەخێر نابێت قوتابیان لەو بڕە پارەیە ببەخشرێن. چونکە من خۆم ئاگام لێیە عەلی حامید لای عەبدوڵڵای برام نەقاڕیی دەکات و ڕۆژیی دینارێکی هەیە!

لەدواییدا چووم قسەم لەگەڵ عومەری هەڵاهەڵا نوێنەرمان کرد لە قوتابیان و پێم وت: ئەمە لای خۆی ئێوە خۆتان هەر بە بنەماڵە هەمووتان کرێکارن، کەچی ئاوا ڕێز لە ڕەنج و ماندوبوونی کرێکاران دەگریت؟! بە دەوڵەمەندیان دەزانیت! پاشان خۆ من ساڵ دوانزەی مانگ ئیشم دەستناکەوێت وا

تۆ ڕۆژیی دیناریکت بۆ هەموو ساڵەکە لە سەر کردوم بە ماڵ و بۆت کۆکردومەتەوە! بەڵکو لە ساڵەکەدا ئەوپەڕی پێنج یاخود شەش مانگ ئیشم دەست دەکەوێت. ئەو پارەیەی کە لە هاویندا پەیدای دەکەم، دەبێت بیدەم بە تڕوتفاق و زەخیرەی بۆ زستان پێ بخەم. مادام تۆ خۆت زۆر چاک ڕاستیی باسەکە دەزانیت و ئاگات لە دۆخی کرێکارانە و خۆتی لێ گێل دەکەیت، کێشە نییە من شەش دینارەکەی خۆم دەدەم، بەڵام دەزانم کوێت دەیەشێت و بۆچی ئەم ناحەزییە ناحەزیی من دەکەیت.

## لەخۆگۆڕان یاخود بەدگۆڕان

موسلێح مستەفا جەلالی، کە لێپرسراوی یەکێک لە دوو باڵەکەی حیزبی شیوعی بوو کە لە عەزیز حاج جیابوونەوە و لە ڕۆژی ١ی مانگی ئایاری ساڵی١٩٦٩دا بەحیساب تەمای بوو لە دەرەویانەوە بەرەو باقوبە بکشێت و لەوێوە شۆڕشێکی سەرتاسەریی دژ بە بەعس بەرپا بکات، بە چوونە کۆشی بەعسەوە هەم خۆی و هەم شۆڕشەکەی یەکلایی کردەوە. موسلێح، کاتێک کە چووە ئامێزی بەعسەوە، لە سەرەتادا کرا بە ئەندامی دادگاکەی ئەوکاتی بەعس کە کوردستانییان و ئۆپۆزیسیۆنی کوردستانیی دادگایی کرد و دواتر حوکمدراوەکانی دادگاکەی چ بە زیندانیکردن یاخود بە لەسێدارەدان، ڕەوانەی موسڵ دەکران.

لە ساڵانی حەفتادا و لەدوای دەستپێکردنەوەی شەڕ و شۆڕش لە دژی بەعس، سەردەمێک کە فایەق دەرەویانی لە

حیزبی شیوعی دوورکەوتبووەوە و چووبووە ناو پارتییەوە و لەوێ لە ناو پارتیدا لە هێڵی جووتیاراندا ئیشی دەکرد، ڕۆژێکیان بە بەیاننامەیەکی بزووتنەوەی جووتیارانی سەر بە پارتییەوە دەستگیر دەکرێت، ئیتر لە کەرکوک دەدرێتە دادگا. لەوێ لە دادگای کەرکوک موسڵیح ئەندامێکی دیار و بەرچاوی ئەو دادگایە دەبێت کە فایەق دەرەویانی دادگایی دەکات، جا وێڕای ناسیاویی و هاوڕێیەتی دێرینی نێوان موسڵیح و فایەق، موسڵیح چاوپۆشی لە فایەق دەکات و لە کۆتاییدا فایەق سزای لەسێدارەدانی بەسەردا دەسەپێنرێت و لەدواییدا لە موسڵ دەدرێت لە سێدارە.

هەر لە سالآنی حەفتادا عەبدولڕەحمانی برام و ڕەزا هەمزە لەسەر پەیوەندیی بە پارتییەوە دەستگیر دەکرێن، لە دادگا عەبدولڕەحمانی برام چاوی بە موسڵیح کەوتبوو و وتبووی من برای عەلی حامید-م کە سەردەمانێک پێکەوە شیوعی بوون. بەڵام موسڵیح خۆی لێ نەبان کردبوو و سەرەنجام دادگاکەی کە موسڵیح ئەندامی بوو، بیست ساڵ زیندانیکردنی دا بە تەنگەی عەبدولڕەحمانی برام و ڕەزا هەمزەی هاوڕێیدا.

لەخۆگۆڕان یاخود ڕەنگە ڕاستتر وابێت کە بڵێم بەدگۆڕان، تایبەتمەندییەکی هەرە دیاری زۆربەی ئەو کەسانە بوو کە ڕۆژگارێک من لە ڕیزەکانی حیزبی شیوعی لەگەڵیان سیاسەت و ئیش و کاری حیزبیم کردووە. موسڵیح یەکێک بوو لەو بەدگۆڕاوە هەرە دیارانە.

## چەند بەسەرهاتێك لە ئەمنی عامی بەغدا

-١-

مانگی ئەیلولی ساڵی١٩٨٩ بوو، لە ئەمنی عامی بەغدا بووم، لەو شوێنەی کە لێی زیندانی کرابووین ڕۆژێکیان سێ کەسیان هێنا و کردیانن بە ژووردا بۆ لای ئێمە. سێ کەسی پۆشتە و پەرداخ و بۆشناخ. لە ژوورێک لە خوار ئێمەوە نیشتەجێیان کردن. هاوڕێیەکم لەگەڵ بوو لەوێ لەپاش یەک دوو ڕۆژ لێمی پرسی: کاک عەلی ئەو سێ کەسە کێن لە ژوورە زیندانین؟ هەڵبەتە بێجگە لەوەی کە دەمزانی هەرسێکیان عەرەبن هیچی ترم دەربارەیان نەدەزانی، بەڵام بەبێ ئەوەی خۆم تێک بدەم، بە هاوڕێکەمم وت: ئەوانە یەکێکیان بەڕێوەبەری تاپۆی کانیی پانکەیە، دووەمیان کاتبی تاپۆیە، سێیەمیان شۆفێری بەڕێوەبەری تاپۆیە.

لە ئەمن وا باو بوو هەموو ڕۆژێک لەدوای کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ دەرگامان بۆ دەخرایە سەر پشت لە ڕاڕەوەکەدا تێکەڵ دەبووین و زیندانییەکان هەموو قسەمان لەگەڵ یەکدی دەکرد و بەسەرهات و هەواڵ و دەنگوباسمان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە. لەم کاتی تێکەڵبوونەدا هاوڕێکەم چوو بوو ئەو زانیارییانەی کە من بۆ شۆخی دەربارەی ئەو سێ کەسە عەرەبە کە هێنایانن و لە خوار ئێمەوە بەندیان کردن، بۆ هاوڕێکانی تری گێڕایەوە. بێگومان کۆمەڵێک زیندانیی تر هەواڵی ئەوەیان زانیبوو کە ئەو سێ کەسە سێ ئەفسەری سەر بە عەدنان خەیروڵڵان. بە نیاز بوون لە جەژنی قوربانی مانگی پێنجی ساڵی١٩٨٩ کودەتایەک بە سەر سەددامدا بکات بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

هاورێکەم پاش ئەوەی لەو تێکەڵبوونەی بەندییەکانەوە هەواڵ و زانیاریی دروستی دەربارەی ئەو سێ کەسە بیست، هاتەوە بۆ لام و وتی: کاک عەلی من ئەو ڕۆژە دەربارەی ئەو سێ کەسە پرسیارێکم لێ کردیت، تۆ وتت کە ئەوانە یەکێکیان بەڕێوەبەری تاپۆی کانیی پانکەیە، دووەمیان کاتبی تاپۆیە، سێیەمیان شۆفێری بەڕێوەبەری تاپۆیە. منیش وتم: بەڵێ وام وت، بەڵام خۆت دەزانیت منیش وەکو تۆ زیندانیم و لێرە پێکەوەین، پاشان تۆ خۆت خەڵکی سەید سادقیت و سوور دەزانیت سەید سادق بەڕێوەبەری تاپۆی نییە، ئیتر کانیی پانکە بەڕێوەبەری تاپۆی لە کوێ بوو!

-٢-

ڕۆژێکی تر دوو کەسیان هێنا لەلای دەرگای خوارەوە دایاننان. یەکێکی تریشیان بە شپرزەی و بە دزداشەیەکەوە هێنا و لای ئێمە دایاننا. بە سەکوت و سمێڵ و قەڵافەتیدا بە ستالین دەچوو. هەر دەوروبەری کاتژمێرێک لای ئێمە هێشتیانەوە. پێش ئەوەی لای ئێمە بیگوازنەوە لێی نزیکبووینەوە و دواندمان، بۆمان دەرکەوت قائیدی فیرقەی چوار بووە لە شەڕی عێراق/ئێران لە ناوچەی پێنجوێن. ناحەزی سەددام بوو، دواتر هەواڵمان بیستەوە لەگەڵ کەسێکی تری خزمیدا دراون لە سێدارە.

دوو کەسەکەی تر کە هێنایانن و لای دەرگاکەوە نیشتەجێیان کردن، لەو شوێنە گواستیاننەوە و شوێنەکەیان بۆ پاککردنەوە و بەتانییان بۆ ڕاخستن و دەرمانی کێچ و مۆرانەیان بە دیوار و سەر بەتانی و جێ و جلەکانیاندا بۆ پرژاندن. لەبەرئەوەی کە ئەمەی بۆ ئەم دوو کەسە کرا پێشتر بۆ کەسی تر نەکرابوو، هەر بۆیە ئێمە ئەم کارەمان بە لاوە سەیر و جێی سەرسووڕمان بوو!

هاوکات کابرایەکی کەساس کە ئەمن لە ناو بازاڕی بەغدا گرتبوویان و بە نەژاد پاکستانی بوو و ئەسپێ تێیدابوو، هێنرا لای ئێمە داندرا. منیش وتم: کوڕینە ئێمە خۆمان ئەسپێ خواردوینی و لە خوا بەزیاد بێت ئەسپێمان زۆرە لە ناو جلوبەرگ و گیان و جێ و نوێنەکانماندا، ئا دەی هەر کەس لای خۆیەوە چەندی توانی لە ئەسپێ کۆی بکاتەوە و بیانخاتە سەر پاکەتێکی جگەرە و لە بەر دەم موحاجەرەکەوە بە فوو ئەودیوی سەر جێ و نوێنی ئەم دوو میوانە بەڕێزەی بکات وەکو بەخێرهێنان و پێشوازیلێکردنیان! ئیتر برێکی باش ئەسپێمان بەو شێوەیە بە فوو هەواڵەی سەر جێ و جلی ئەو میوانانە کرد کە ڕێزلێنانیان بەو جۆرە جێی پرسیار بوو.

-٣-

ڕۆژانــە خەڵکیان دەهێنا بۆ ئەمن و لـەوێـوە دەبـران بۆ مەحکەمەی سـەورە. ڕۆژ نەبوو پۆلێک شیعە لە سیاسی و سەربازیی و سڤیل نەهێنن و ڕەوانەی مەحکەمەی سەورەیان نەکەن لە ئەبوغرێب.

هەر لە نزیکی مانگی ئەیلولدا سێ کەسیان هێنایە لای ئێمە. کاتێک کە نزیکبوونەوە لێمان یەکێکیانم ناسییەوە، ناوی حاجی ئەحمەد بوو، پاسەوانی گەڕاجی کارگێڕێی خۆجێی سلێمانی بوو، ماڵیان لە گەڕەکی خەبات بوو. خۆی و کوڕەکەی و کەسێکی تر بوون پێکەوە دەستگیرکرابوون. کەسی سێیەم برازای دکتۆر سدیق (لـە کـوردەواریـی لای خۆمان ناوبردنی یـاریـدەدەری پزیشک یاخود برینپێچ بە دکتۆر، باوێتی)ی چاوەکە بوو.

کوڕەکەی حاجی ئەحمەد کادری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، دووکانی هەبوو لە بازاڕی جیهان لە سلێمانی. دەرکەوت پەیوەندیشی هەیە بە ڕێکخستنەکانی یەکێتییەوە لە کەلار. وەک بیستمان برادەرێکی خۆی بە دزییەوە چووەتە ئەمن و هەموو نهێنییەکانی داوە بە ئەوان و بە گرتی داوە. کاتێک کە لەگەڵ ئەو برادەرە کەلارییانە ئەدواین کە لە ئەمن لەگەڵماندا بەند بوون، بۆمان دەرکەوت کەلارییەکان لە حاجی ئەحمەد و کوڕەکەی زۆریان سڵ دەکردەوە و بە گومان بوون. چەند جارێک حاجی ئەحمەد و کوڕەکەی بران بۆ مەحکەمە و لەدواییدا برانەوە بۆ سلێمانی.

ڕۆژێکی تر سێ کەسی تریان هێنا هەرسێکیان برا بوون. یەکێکیان کە برا گەورەکەیان بوو، پاسەوانی باخچەی ساوایان بوو لە گەڕەکی ڕزگاری لای خۆمان لە سلێمانی. برا ناوەنجییەکە کە ناوی عەلی خەمزەیی بوو، سەربازی هەڵاتوو بوو. لەگەڵ دوو کەسی تر و لە ڕێگای گۆیژەوە گەڕابووەوە بۆ سلێمانی دەستگیرکرابوون. دوو کەسەکەی تر یەکێکیان کەمال دۆڵپەموویی و ئەوی تریان فەتاح ناوێک بوو بە فەتاحە سوور ناسراو بوو و خەڵکی مەڵکەندی بوو و برای وەستا ساڵحی ناسراو بە سالە سوور بوو کە یاریچی تۆپی پێ بوو. گوایە ئامر هێزی پارتی بووە دواتر چووەتە لای بزووتنەوە.

عەلی خەمزەیی لە ئەمن ئەوەندەیان بیراز کرد خەریکبوو بمرێت، گیانی بە برا گەورەکەی بوو کە نەمرد. ئەم سێ کەسە هەرسێکیان بەر لە ئێمە درانە دادگا و دادگای سەورە یەکی حەوت ساڵی دا بە تەنگەیاندا.

-٤-

لە یەک و دووی مانگی نۆی ساڵ١٩٨٩ یەکە یەکە بانگیان کردینە خوارەوە و بە گەرمیی هەڕەشەیان لێ کردین و چاویان لێ سوورکردینەوە کە ئێرە ئەمنی عاممە و خراپتان بە سەر دەهێنین.

هاتن منیان برد، کەلەپچەیان کردم و چاویلکەیەکی ڕەشیان کردە چاوم و دەستیاندایە بن هەنگڵم و لەگەڵ خۆیان بردیانمە خوارەوە. بە کەلەپچەکراوی و لە ژوورێک و لە پاڵ دیوارێکدا، بە پێوە ڕایانگرتم. قەدەرێکی زۆر بەو جۆرە مامەوە، تەواو شەکەت بووم، کەسێک لێی نەپرسیمەوە لێرە چی دەکەیت و لە کوێوە هێناویانیت!

لەم کاتەدا و کتوپڕ گوێم لە دەنگی میاواندنی پشیلەیەک بوو. پێشتر بیستبووم لە ئەمنی عام پشیلە و سەگ بەرئەدەنە گیانی زیندانییەکان وەک شێوازێکی سزادان. لە دڵی خۆمدا وتم: من پەیمانم بە خۆم داوە مەگەر لاشەکەم بەرنەوە، ناپاکیی نە لە نیشتمان و نە لە حیزبەکەم دەکەم. خەیاڵ بردبوومییەوە کەسێک هات بۆ لام و وتی: ناوت چییە؟ وتم: عەلی. وتی: دەزانی ئێرە کوێیە؟ وتم: نەخێر. وتی: ئێرە ئەمنی عامە، پارچە پارچەت دەکەین. منیش لە دڵی خۆمدا وتم: مادام لە پشیلەکە ڕزگارم بوو، ئیتر قەیناکە، چی دەبێت با ببێت. ئەو کەسە کە لەگەڵم دوا دیاربوو ئەفسەری ئەمن بوو، بانگی یەکێکی تری کرد و وتی: وەرە پەلی بگرە و بیبەرەوە بۆ سەرەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.

# -٥-

یەکێک لە کەلارییەکان کە ناوی حاجی نوری بوو و شۆفێری گەڵابە بوو، کەلارییەکان زۆر خۆیان تێنەدەگەیاند و توخنی نەدەکەوتن، دەیانوت ئەم کابرایە شەڕی بووە لەگەڵ حەمەی عیسا کەلاریی. لە ئەمن چەند جارێک بردیانە خوارەوە و زۆریان ئەشکەنجەدا. بەڵام حاجی نوری پیاوێکی ئازا و خۆڕاگر بوو. دواجار کە بردیان ئیتر نەیانهێنایەوە و چاومان پێی نەکەوتەوە و کەسیش باسی نەکرد چی بە سەر هات.

ڕۆژێکی تر کەسێکیان هێنا لەدواییدا زانیمان ناوی (س.م) ـە و خەڵکی کفرییە و لێپرسراوی پێشمەرگەی یەکێتییە لە گەرمیان. کەلارییەکان سڵیان لێدەکردەوە و خۆیان نەدەکرد بە خاوەنی. ئێوارەیەک نزار مستەفا چاوجوانی هاوڕێی خۆمان پیاسەی دەکرد لەگەڵی، لەدواییدا نزار هات بۆ لام و وتی: کاک عەلی ئەم پیاوە دۆخی زۆر خراپ و پەرێشانە، ورەی بەرداوە. نزار داوای لێ کردم کە سبەینێ دوای نیوەڕۆ کاتێک کە دەرگای تێکەڵاوبوون و یەکتربینینمان لێ دەخەنە سەر پشت بچم بۆ لای قسەی لەگەڵ بکەم و دڵی بدەمەوە. منیش لە سەر داخوازییەکەی نزار چووم بۆ لای (س.م) و بە دوورودرێژیی لەگەڵی دوام.

(س.م) خۆی بۆ گێڕامەوە کە فێڵیان لێ کردووە و بەگرتیانداوە. حەمەی عیسا بەگرتیداوە. شەو بۆ میوانداریی چووە بۆ کەلار بۆ ماڵی حەمەی عیسا. (س.م) دەیوت: حەمەی عیسا مستەشارە و فەوجی هەیە. لە ژووری میوان لە ماڵی حەمەی عیسا دانیشتووە، لەپاش بەینێک ماستاویان بۆ هێناوە

و ئەمیش خواردویەتییەوە، کاتێک کە بەئاگاهاتووەتەوە لە ئیستیخباراتی عەسکەریی بووە لە بەغدا و بە دەم وڕێنەکردنەوە هاتووەتەوە هۆش خۆی!

(س.م) وتی ئەمن لە ڕێگای منەوە بڕێک شتیان دەستکەوتووە. وتی: دوو مفەوەزی ئەمنم بە دەستی خۆم کوشتووە، باوک و خێزان و کەسوکارم لە شاڵاوەکانی ئەنفالدا تیاچوون و پێموایە هیچ شتێک ناتوانێت من لە لەسێدارەدان ڕزگار بکات، بەڵام چیم بۆ کرابێت تەخسیریم نەکردووە و کردومە. وتی لە گەرمیان بووم لە سەرکردایەتییەوە دوانزە پێشمەرگەی ئیسلامییان بۆ ناردم، وتیان با جارێ لای تۆ بن تا خۆمان جوابت لێ دەگێڕینەوە. ماوەیەک لای من مانەوە، بەڵام ئەم پێشمەرگانە هەموو ڕۆژێک داوای ئەوەیان لێ دەکردم بیاننێرم بۆ ئەفغانستان بۆ جیهاد. منیش پێمدەوتن: ئەفغانستان ئەفغستانی چیتانە؟! کوردستان وێرانکراوە، بۆچی پارێزگاریی لە خاک و نیشتمانی خۆتان ناکەن؟! بەڵام هیچ سوودی نەبوو، تەواو بێزاریان کردبووم. ئیتر منیش لە حەوسەڵەمدا نەما، ڕۆژێک لەگەڵ خۆم بردمن بۆ کەندەلانێک، لەوێ جێمهێشتن و وتم: چاوەڕێم بکەن دەچم لەگەڵ سەرکردایەتی دەربارەی بابەتی ناردنتان بۆ ئەفغانستان قسە دەکەم و ئێستا دەگەڕێمەوە بۆ لاتان. لێیان دوورکەوتمەوە و کەندەلانم تەقاندەوە بە سەریاندا و لە دەستیان ڕزگارم بوو! وتم: دەی بۆ خۆتان بچن بۆ ئەفغانستان!

لەپاش ماوەیەک (س.م)یان برد بۆ دادگا، بەڵام ئەوە دواجار بوو و ئیتر نەمبینییەوە.

## درۆکردن بە دەمی مارکسەوە

حەمەئەمین پێنجوێنی لە سالانی شەستدا شیوعی بوو، بەلام موختەفی بوو، یاخود با بڵێین خۆی شاردبووەوە. لە سلیمانی لە دوو ماڵدا خۆی دەشاردەوە، ماڵی شێخ تەیب، خوشکەزای سەید باقی هەڵەبجەیی، ماڵەکەیان لای گەڕاجی ئێستای پاسەکانی ڕزگاری بوو، هەروەها ماڵی حەمەئەمین ڕەسوڵ کە لە پۆستەی سلێمانی فەرمانبەر بوو و ماڵەکەیان لە شیوی قازی بوو لە پشت ماڵی عەبدەی سایەق بەرانبەر ماڵی عەلی چەلەبی.

لە کاتی کەرتکارییەکەی عەزیز حاجدا لە مەسڵەحە دامەزرابوو، لەوێ لە مەسڵەحە ڕۆژانە دەمبینی. حەمەئەمین زۆرجار دەچوو بۆ ژووری محامییەکان بۆ لای حسێن عارف. ڕۆژێکیان چووم بۆ کتێبخانەی گەلاوێژی ڕەئوف مەعروف، کۆمەڵێک خەڵکی زۆر دانیشتبوون و باس و خواس گەم بوو، حەمەئەمین بەگەرمی باسی مارکسیزمی دەکرد. دوای تەواوبوونی قسە و باس و هاتنە دەرەوەمان لە کتێبخانەی گەلاوێژ، چوومە پاڵ حەمەئەمینەوە و پێم وت: ئەرێ تۆ عەیب ناکەیت درۆ بە دەمی مارکسەوە دەکەیت لە کاتێکدا کە خۆی لە ژیاندا نەماوە؟ حەمەئەمین پێنجوێنی وتی: دە بڕۆ مردوت مرێ، مارکس خۆی مابوو کاتێک کە خەڵک درۆیان بە دەمییەوە دەکرد!

## چیرۆکی ئەحە نەبەرد

ناحەزانی حیزبی شیوعی کە لە ئاوی لێڵدا مەلەیان دەکرد، هەموو هەوڵ و توانای خۆیان خستبووە گەڕ بۆ کۆکردنەوەی ناحەزانی ئەو حیزبە لە دەوری خۆیان. دەگێڕنەوە لە سالانی پەنجادا کە ئەوکات لە سلێمانی باو باوی شەقاوەچێتی و شەڕە

گەڕەک بوو، گوایە ئەحمەد نەبەرد، کە موڕاقیب بوو لە شارەوانیی سلێمانی و لە بەر سەختیی ژیان و بژێوی لەو سەردەمەدا لەپاش کاری فەرمانگەکەی لە پشت ئامادەیی سلێمانی کچان سندوقێکی بە دەستییەوە دەگرت و وەک چایخانەی گەڕۆک چای دەفرۆشت و خەڵکی ئەو ناوەی سەرکارێز و سابوونکەران لە دەوری خڕدەبوونەوە.

وەک وتم لەو کاتەدا خەڵک حەزی بە سنگ دەرپەڕاندن و شەقاوەچێتی بوو، جا دەڵێن لەو سەردەمە و لە گەرمەی ئەم بەزمی شەقاوەچێتییەدا، ئەحە نەبەرد کە لەگەڵ حەمکوڵ هاوڕێیش بوون، حەمکوڵ دەکوژێت. لەدوای تێپەڕبوونی سالانێک بە سەر ئەو ڕووداوەدا، ناحەزانی حیزبی شیوعی لە دەهەی شەستەکاندا ئەم دوژمنایەتییە زیندوو دەکەنەوە و دنەی کوڕەکەی حەمکوڵ دەدەن ئەحە نەبەرد بکوژێت کە ئەندامی حیزبی شیوعی بوو. ڕۆژێک ئەحە نەبەرد لە چایخانەکەی سابوونکەران دانیشتبوو، کوڕەکەی حەمکوڵ، بەبێ هەڕەشە و ئاگادار کردنەوەی پێشوەختە، هەڵدەکوتێتە سەر ئەحە نەبەرد و لە تۆڵەی باوکیدا لە ناو چایخانەکەدا دەیکوژێتەوە. ئەمە لە کاتێکدا کە هەم ئەحە نەبەرد مرۆڤێک بوو چوو بووەساڵەوە و هەمیش ڕێگای یاسا و سکاڵا نەبڕابوو تاکو کوڕەکەی حەمکوڵ لە دژی ئەحەد نەبەرد بیگرێتە بەر ئەگەر ڕاستە کە ئەحە باوکی ئەوی کوشتووە.

## فەلاقەکردنەکەی ئەمنی سلێمانی

شەوی ١ لە سەر ٢ی مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٩، لەپاش شەوێک لە دەستگیرکردنم، کتوپڕ و بەو نیوە شەوە دەنگی زڕڕەی کلیل و کەلەپچە بەرەو ئەو ژوورە کە لە ئەمنی سلێمانی

تیایدا بەند بووم نزیکبووە. هێشتا پاسەوانەکان نەگەیشتبوونە بەر دەم ژوورەکە، ئێمە ئەوانەی کە لەو ژوورەدا بەندکرابووین هەموو ڕاکشاین و خۆمان کرد بە نووستوو. دوو جەللاد خۆیان کرد بە ژووردا و بانگیان کرد: عەلی حامید، شەوکەت شەریف. ئینجا هەردووکمانیان کەلەپچە کرد و دەستیان دایە باڵمان و لەگەڵ خۆیان بردیانین. بردیانینە بەر دەم هۆدەیەکی بێ دەرگا، هۆدەیەکی بەرین و گەورە، بە مەزەندەی ئەقڵ بەرزییەکەی چوار مەترێک دەبوو. کەلەپچەیان لە دەستمان کردەوە و دایاننایینە سەر زەوی و دوو تێڵایان هێنا هەریەک بە جیا قاچمانیان پێوە گرێدا. بۆ هەریەکەمان دوو کەسیان هێنا ئەمسەر و ئەوسەری تێڵایان گرت و بەرزیان کردەوە.

هەڵبەتە من پێش ئەوە ناوی فەللاقەم بیستبوو، بەڵام تا ئەو کاتە نەمدەزانی ئا ئەمەیە فەللاقە! بە کێبڵ و دار کەوتنە لێدان لە بنی پێمان، لە بنی پێ و پوز و ئەژنۆمان، لەو کاتەیشدا هەردوو دەستمان لە کەلەپچە و لە ژێر لەشماندا بوو. هەڵبەتە چەند لە سەر کەلەپچەکە کە لە ژێرتدایە زیاتر بجووڵێیت، کەلەپچەکە زیاتر لە دەستتدا توند دەبێت و دەجەڕێت. پیاوێکی تری ئەمنیشیان هێنابوو لە لامانەوە وەستابوو دەستی بە بەنەخوێنەکەیەوە گرتبوو و هەڕەشەی لێ دەکردین و دەیوت: دەتانگێم!

لەپاش ئەوە شەوکەتیان بە کەلەپچەوە بە بنمیچی ژوورەکەوە هەڵواسی، بە شوێن ئەویشدا منیان هەڵواسی. بە جۆرێک ئەو لە سەرێکی ژوورەکە بوو و من لە سەرێکی تری ژوورەکە بووم. ئەم بارە هەر ئەوەندەی خۆش بوو کە کورسی لە ژێر پێماندا

بوو، بەڵام خولەکی نەبرد کورسییان لە ژێر پێماندا لابرد و بەم جۆرە بە بنمیچەوە هەڵواسراین. ئینجا جەللادەکان هەموو لە ژوورەکە چوونە دەرەوە و لەو دۆخەدا جێیانهێشتین. بەو شێوەیەی کە تێبینیمان کرد دیاربوو کە لەودیو دەرگاکەوە خۆیان گرتبوو و چاودێرییان دەکردین.

هاوارمان دەکرد: پشتم شکا، قۆڵم دەرهـات! بەڵام هەموو کاردانەوەیەکی جەللادەکان ئەوە بوو دەهاتنە ژوورەوە، یەک دوو کێبڵیان دەکێشا بە قۆڵ و پشتماندا و دیسان دەچوونەوە دەرەوە. ئاگامان لە کات نەبوو، نەمانزانی ئەم فەللاقەکردن و هەڵواسینە چەندی خایاند. من چرکەیەک لە شانی چەپمەوە هـات، ئـازار و سوێیەکی زۆری خستە دڵمەوە، هەر بۆیە پڕ بە ژوورەکە هاوارم کرد: قۆڵم شکا، باڵم دەرهات! جەللادەکان خێرا خۆیان کرد بە ژووردا، کورسییان دا نا و قۆڵمیان کردەوە. ڕاستییەکەیشی هەر وا بوو، وام هەستکرد کە قۆڵم تـرازاوە و دەرهاتووە. بە هەمان شێوە شەوکەتیشیان داگرت. ئنجا بە قاچوقولی هەڵئاوساو و گیانی لە ئارەق هەڵکشاو و تۆزاوییەوە بردیانینەوە بۆ ژوورەکەمان.

هاوڕێیانمان، کە تا ئەو کاتە کەسیان ئەشکەنجە نەدرابوون، کاتێک کە چاویان پێمانکەوت لە تۆز و ئارەق و خۆڵدا گەوزێنراوین و هەموو گیانمان ئاوساوە و شین هەڵگەڕاوە، ترسیان لێ نیشت و ورەیان دابەزی. لەم کاتەدا داوام لێ کردن کە با بۆ خۆمان یارییەک بکەین! ئەگەرچی دەستی چەپم ئیشی نەدەکرد، بەڵام لەبەر ئـەوەی کە یاریی کڵاوێن، ئەگەر تیایدا کەسێکی تر کاری شاردنەوەی ئەنگوستیلە یان ئەو پارە کانزاییە بکات

کە لە ژێر کڵاو یان گۆرەوییەکدا دەشاردرێتەوە، دەستی تێدا بەکارنایەت و زیاتر پێویستی بە هەڵهێنانە، یاریمان دامەزراند و بۆ لەبیربردنەوەی ئازارەکانی خۆم و دوورخستنەوەی سەرنج و هۆشی هاوڕێیانیش لەو ئەشکەنجەیەی کە ئەشکەنجەماندرا، ماوەیەکمان بەم یارییە بەسەربرد.

## عەبە زێوێیی

سەرەتای ساڵانی شەست و لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی عەبدولسەلام عارفدا، شەو دەچووین لە چایخانەی عەلی لە گەڕەکی خەبات دادەنیشتین، هەر دەنگوباس و هەواڵێکیش هەبووایە دەمانبیست و دواتر بۆ یەکتریمان دەگێڕایەوە. شەوێکیان هەواڵی ئەوەم بیست کە حکومەت زەلامێکی لە گەڕەکی خەبات داناوە ناوی عەبە زێوێییە و کەسێکی تری لەگەڵدایە ناسراوە بە خولەی ئەمینی بووک سەرشەقامی و هەواڵ و دەنگوباس بۆ حکومەت کۆدەکەنەوە. خولەی ئەمینی بووک خزمایەتی هەبوو لەگەڵ خێزانی عەلی ئەحمەدی حوسنی قەرەتۆغانی.

زۆر شەو کە دەچوومە چایخانەکە، ئەو ڕادیۆیەی کە هەمبوو، لەگەڵ خۆمم دەبرد، لەوێ دەمانخستە سەر ئێستگەی کوردیی ڕادیۆی ئێران و جاروباریش بە دەم گوێگرتن لە ڕادیۆوە یاریی دۆمینەمان دەکرد. ئاگام لەوە نەبوو عەبە زێوێیی لەدوای ئێمە ئەویش هاتووەتە چایخانەکە و لە پشت منەوە و ڕوو لە دەرگای چایخانەکە دانیشتووە. عەبە کوڕێکی گەنج بوو، هەربینا لە پشتمەوە بوو بە غەڵبەغەڵب و شەڕ، هەستام ئاوڕبدەمەوە تاکو

بزانم چی ڕوویداوە، لەگەڵ ئاوڕدانەوەمدا عەبە مشتەکۆڵەیەکی کێشا بە لا چاوی منیشدا، ئەگەر بەر چاوم بکەوتایە بێ سێ و دوو چاومی دەتەقاند! دیاربوو عەبە، لەگەڵ ئەوانەدا بە شەڕ هاتبوو کە لە سەر مێزێک لەگەڵی دانیشتبوون، بەڵام کاتێک کە منیش لام کردەوە عەبە وەکو پیاوی حکومەت، ئەوەیش قەڵسی کردبوو کە ڕادیۆم لە سەر ئێستگەی کوردیی ئێران دانابوو، بۆیە دەستی لە منیش وەشاند.

بۆ سبەینێ شەڕەکە کەوتە دەم خەڵک و وا بڵاوبوویەوە کە عەبە سەرخۆش بووە و دوێنێ شەو لە چایخانەکە شەڕی کردووە. من لەو کاتەدا لە مەسڵەحەی نەقلی ڕیکاب بووم، بڕێک بە ناو پێشمەرگەی ناو شاری پارتی هەبوون کارمەندی مەسڵەحە بوون، کاتێک کە لەگەڵ عەبدولڕەحمانی برام چووین بۆ مەسڵەحە و منیان بەو شێوەیە بە لا چاوی شینەوە بووەوە بینی، مۆڵەتیان دا پێم و وتیان تۆ ئەمڕۆ بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە و بۆ ئەوەی کە ئاوایشت لێ کراوە دەنگ مەکە ئێمە خۆمان عەبە چار دەکەین.

دەتوانم بڵێم مانگێکی برد و نەبرد، ڕۆژێکیان عەبە لە چایخانەکەی عەلی لە گەڕەکی خەبات دانیشتبوو، پێنج شەش کەس بۆی هاتنە ناو چایخانەکەوە و پەلاماریاندا و ئەوەی ئەو بە تەمای نەبوو پێیان کرد، بە شەق و مشتەکۆڵە بەربوونە سەر و گوێلاک و گیانی و بەوەیشەوە نەوەستان تەپڵەکێکی داری چایخانەکەیان لە سەریدا شکاند، پاشان پەلیانگرت و لەگەڵ خۆیاند بردیان.

پێموایە هەمووی لەدوای ساڵێک لەو ڕووداوە ڕۆژێکیان لە کاتێکدا کە عەبە لە خوار باخی شێخ لەتیف لای مزگەوتی کانیی

دۆمان بە ڕێبواری دەڕۆیشت، لە ناو پەرژینی باخەکەدا دوو کەس بۆی دانیشتبوون لێی هاتنە دەست تەقەیان لێ کرد و کوشتیان.

دواتر وا بڵاوبووەوە کە دوو تەقەکەرەکە مچەی باوە گەورە و کامیلی شەفیق بوون، کە وەک قرژاڵ بە دوو سەرە دەڕۆیشتن و ئیشیان بۆ پارتی دەکرد لە ناو شار و ناوبەناو دەستیان لە پیاوەکانی حکومەت دەوەشاند.

## ئەو ئافرەتەی کە نائیب لە بەر خاتری خۆی دایناوە

بەردەوام سەردانی کتێبخانەی گەلاوێژی ڕەئوف مەعروفم دەکرد، سەرەتای ساڵانی حەفتا بوو، ڕۆژێکیان چووم بۆ کتێبخانەکە، وەک زۆربەی کاتەکانی ئەو ڕۆژەیش مشتومڕ و قسەوباس لە کتێبخانەکەدا گەرم بوو، کتێبخانەکە کەسی تری نەدەگرت. مشتومڕ لە سەر مافی ئافرەت بوو، گلەیی لە حیزبی شیوعی دەکرا، بەتایبەتی محەلیی سلێمانی کە تاکە یەک ئافرەتی تێدا نییە، یەکێک لەوانەی کە بەشداری ئەم مشتومڕە بوو هەڵیدایێ و وتی: با محەلیی سلیمانی حیزبی شیوعی یەک ئافرەتی تێدایە، ناوی (س)ە، لەم کاتەدا مامۆستا شێخ ڕەئوف، برای مامۆستا شێخ جەلال، بە دەنگی بەرز وتی: ئەو ئافرەتە نائیب عەبدوڵڵا لە بەر خاتری خۆی هێناویێتی و لەو شوێنەدا دایناوە!

ڕاستییەکەی منیش ئەم قسەیەم زۆر لە دڵدا گران بوو و نەمدەزانی ئەم مامۆستا شێخ ڕەئوفە کێیە. هەروەها ئافرەتەکەیش کە ناوی (س) بوو، ئەویشم هەر نەدەناسی. بە تەما بووم کۆڕی

گەرمی قسە و باسی کتێبخانەکە جێبهێڵم و بچمە دەرەوە، چاوەڕێ بکەم تاکو شێخ ڕەئوف دێتە دەرەوە و بڕوات تاکو حەسیرمەیدانێکی چاکی بکەم! باش بوو پێش ئەوەی ئەم بڕیارە بدەم لە ڕەئوف مەعروفم پرسی: ئەو پیاوە کێیە کە ئەو قسانە دەکات؟ ڕەئوف مەعروف وتی ئەوە شێخ ڕەئوفی برای مامۆستا جەلالە. ئیتر لەوەی کە بە تەما بووم بیکەم، بامدایەوە.

سالّ تێپەڕی و سالّ هات، منیش وەکو مامۆستا شێخ ڕەئوف ئەو ڕاستییەم بۆ دەرکەوت. بە ڕێکەوت جارێکیان لەو بارەیەوە پرسیارم لە (م.ت) کرد، ئەویش هەمان قسەکانی مامۆستا شێخ ڕەئوفی کردەوە و وتی: ئەم ئافرەتە لە شەستەکانیشدا لە هەڵەبجە هەر لەگەڵ نائیب بووە!

## سوێندەکەی ئەحەڕەش

ساڵی ١٩٦٧ حیزبی شیوعی عێراق بە هۆی عەزیز حاج و تاقمەکەیەوە تووشی کەرتبوونێکی گەورە هات. لە سلێمانی بەهادین نوری کە بەوە ناوبانگی ڕۆیشتبوو لەگەڵ کەرتکارییەکەی عەزیز حاجدا نییە، عەزیز حاج لە بەغدا ئەویشی گرتبوو بەڵام لەدواییدا بەهادین نوری لە دەستی هەڵهات. ئێمە ئەم پێنج شەش کەسە لە سلێمانی: من خۆم، مەلا حەمەومینی برای مەلا عەلی، شەهید جەلال سەعیدی ناسراو بە جەلالی ڕابیعە، کە فەرمانبەر بوو لە کارگەی جگەرەی سلێمانی. سەعە سوور جافەرانی، فایەق دەرەویانی، لە چایخانەکەی ئەحەڕەش قەرەداغی لای نەقلیاتی قەرەداغ لە خوار شەقامی کاوە دانیشتبووین، باس باسی بەهادین نوری بوو، لەم کاتەدا ئەحەڕەش بە بەر چاوی هەموومانەوە

سوێندی ناموسی خوارد و وتی: ئەگەر لەپاش پەنجا ساڵی تریش بووە، بەهادین نوری واز لە حیزبی شیوعی دەهێنێت و دادەنیشێت! قسەکەی ئەحەڕەش ڕاست دەرچوو، بەهادین دەستی لە حیزب هەڵگرت و چووەوە تەکێ لە قەرەداغ و سەر ماڵ و حاڵی باوباپیرانی و خۆی بە باخە هەنارەوە خەریک کرد.

## فیشاڵی دامەزراندنی سۆشیالیزم

بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتنخوازمان لەگەڵ حیزبی بەعس لە ١٩٧٣دا کرد و قۆناغێکی نوێ لە ژیانی حیزبدا دەستیپێکرد، چونکە حیزب بە ئاشکرا کار و چالاکیی سیاسی دەکرد و بارەگا و مقەڕمان لە شار و شارۆچکەکانی کوردستاندا کردەوە. لە یادمە بۆ بارەگاکەی حیزب لای گردی سەیوان، بڕیک چەکمان وەرگرت، هەر ئەوکات ژمارەیەک هاوڕێ کە ناوەکانیانم زۆر باش لە یاد ماوە و بریتی بوون لە: ئەحمەد مارف نانەوا، کە نانەواکەی بە تەنیشت بارەگاکەوە بوو، بەڵام ئامادە نەبوو شەوێک لە مقەڕ بمێنێتەوە. سەید تۆفیق، کە کادرێکی جووتیاریی هەڵەبجەیی خەڵکی عەبابەیلێ بوو. شێخ سەعید، برای شێخ عەلی شێخ حسێن بەرزنجی. ئەم سێ هاوڕێیە هەرسێکیان لە کاتی دابەشکردنی چەکەکاندا لە مقەڕ، نازانم چ شتێک مەستی کردبوون، وتیان: ئەم چەکانە کە ئێستا دەتاندەینێ، هینی خۆمانە، چەکی حیزبە، تا دامەزراندنی ڕژێمی سۆشیالیستی دایانێین!

لە ساڵی ١٩٧٨دا، کاتێک کە ئیتر خۆری بەرەی نیشتمانیی پێشکەوتنخواز بەرەو ئاوابوون دەچوو و حیزبی بەعس هەڵمەتی ڕاوەدوونان و تەنگپێهەڵچنین و گرتنی شیوعییەکانی دەست پێ

کرد، حیزب لە ماوەی بیستوچوار کاتژمێردا هەرچی چەکێکی هەبوو کۆیکردەوە. ئێستایش نەمزانی ئەو چەکانە، کە هینی حیزب بوون، ئەگەر کۆکرانەوە بۆ کوێ بران و چییان لێ کرا و کێ بردنی و چۆن بۆچی بەر لە دامەزراندنی ئەو ڕژێمە سۆشیالیستییەی کە بڕیار بوو دایبمەزرێنین، کۆکرانەوە؟! وادیارە ئەوەی کە پێمان وترا: ئەم چەکانە دانانێین تا ڕژێمی سۆشیالیستی دادەمەزرێنین، پێنج ساڵی ویست تاکو دەربکەوێت کە فیشاڵ بوو.

## ئەکرەمی حەپسە

پێموایە ساڵی ١٩٨٠ بوو، لەگەڵ عومەر کەمالانی، کە ساڵانێکی زۆر پێکەوە شیوعی بووین، چووین بۆ موسڵ بۆ سەردانی دوو کوڕی لە بەندیخانەی موسڵ کە بڕیاری لەسێدارەدانیان بە سەردا درابوو و بڕیاربوو هەمان ڕۆژ لەسێدارە بدرێن. هەمان ڕۆژ سەردانی ئەکرەمی حەپسە، برای وەستا محەمەد، ناسراو بە حەمەی وەستا حەمەئەمینە خێڵ-م کرد، کە ئەویش لە هەمان بەندیخانە بوو و دوا کاتەکانی ژیانی لە چاوەڕوانیی بڕیاری لەسێدارەدانـدا بە سـەر دەبـرد. ئـەکـرەم، کە کەسوکارەکەی هاتبوون بۆ لای، کاتێک کە منی لە ناو کەسوکارەکەیدا بینی سەری سوڕما! بۆچی؟! تێنەگەیشتم. بەهەرحاڵ باوەشم پێدا کرد و بە گریان و چاوی پڕ فرمێسکەوە ئەملا و ئەولایم ماچ کرد و ماڵئاواییم لێ کرد. ئەوەندەی لە یادم ماوە کاتژمێر چواری ئێوارەی هەمان ڕۆژ دوو کوڕەکەی عومەر کەمالانی و ئەکرەمی حەپسەیش بڕیاری لەسێدارەدانەکەیان جێبەجێکرا و دران لە سێدارە.

## دەرکردن لە خانووی حکومەت

پێموایە لە شوێنێکی تری ناو ئەم یادەوەرییانەدا باسی ئەوەم گێڕاوەتەوە کە لە ساڵی ١٩٧٤ و بە هۆی خزمەتی فەرمانبەرییەوە لە یەکێک لەو خانووە حکومییانەدا نیشتەجێکرام کە ژمارەیان دە خانوو بوو و لە گەڕەکی گۆیژە بوون. جا لەپاش تێکچوونی پەیوەندیی نێوان حیزبی بەعس و حیزبی شیوعی لە ساڵی ١٩٧٨ بە دواوە، من بەردەوام بە بیانووی ئەوەی کە عومەری برام پێشمەرگەی حیزبی شیوعییە، بێجگە لەوەی کە هەڕەشەی دەرکردن لە خانووم لێ دەکرا بانگیش دەکرام بۆ ئەمن و گێچەڵم پێ دەکرا.

ڕۆژێکیان هەر لە کارگێڕیی خۆجێیی کە لەوێ فەرمانبەر بووم، بانگیانکردم بۆ ژوورەکەی یاریدەدەری پارێزگار کە لەو کاتەدا هیدایەت عەبدولڕەحمان، کە خەڵکی کارێزەی لای کفری بوو، یاریدەدەری پارێزگار بوو. لە یادمە کۆمەڵێک خەڵکی تریش لەوێ لە ژوورەکە دانیشتبوون، لەوانە: نەژاد عوسمان کە ئەندازیار و سابوونکەرانی بوو، کەمال ئیبراهیم، ئەم دوانە هەردووکیان لە فەرمانگەکەی خۆم فەرمانبەر بوون. هەروەها سەلاح مەلا ئەحمەد، کە لە مەسڵەحەی نەقلی ڕیکاب فەرمانبەر بوو و ئەوانیش وەکو من بۆ دەرکردن لە خانووی حکومەت و لە سەر ئەوەی کە برایان لە دەرەویە لەگەڵ پێشمەرگە، بانگکرابوون.

لەوێ لە ژوورەکەی یاریدەدەری پارێزگار دەستیان بە بەقسەهێنانمان کرد، پرسیاریان لە من کرد: براکەت لەگەڵ کێ ئیش دەکات؟ وتم: لەگەڵ حیزبی شیوعی. وتیان: لە کوێیە؟ وتم: ئەحمەدئاوا. وتیان پەیوەندیت چییە لەگەڵی؟ وتم: هیچ پەیوەندییەکم لەگەڵی نییە، چونکە لەگەڵ من نەژیاوە و کاتێک کە چووەتە

دەرەوەیش پرسی بە من نەکردووە. ئەو پرسیارانەی کە لە منیان کرد، لەو کەسانەی تریشیان کرد کە ناویانم هێناوە. هەموومان وەڵامەکەمان بەو جۆرە بوو کە لە ئێستادا سەردەنیک تێکەوتوین کوڕ بە قسەی باوکی خۆی ناکات، ئیتر برا چۆن بە گوێی برای خۆی دەکات. لە یادمە ئەوانەی کە ئێمەیان بە قسە دەهێنا ژمارەیەکیان ئەفسەری ئەمن بوون، هەر بۆیە وتم: ئێوە بەڕێزتان کە ئەفسەری ئەمنن، پرستان بە باوکتان کردووە کە بوون بە ئەفسەری ئەمن؟ وتیان تەواو، بڕۆن، بڕیاری ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و سەددام حوسێنە، بەم زووانە هەر فەرمانبەرێکی حکومەت کە لە خانووی حکومەتدا نیشتەجێیە و کەسی پلە یەک و دوو و سێی لەگەڵ یاخیبووانە، نابێت لە خانووی حکومەتدا بمێنێت.

دواجار لە ڕۆژی ١٩٨٥/٦/١٧دا، بڕیاری دەرکردنمان لە خانووی حکومەت، بە واژۆی جەعفەر عەبدولکەریم بەرزنجیی پارێزگاری سلێمانی، دەرچوو و بوو بە ڕاست. لە یادمە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەو کاتەدا لە خانووی میریی دەردەکران، حەڤدە کەس بوون. حکومەت پانزە ڕۆژی وەک مۆڵەت بۆ چۆڵکردنی خانووەکە دا پێمان، هەر کەسێکیش لەو ماوەیەدا خانووەکە چۆڵ نەکات و کلیلەکانی ڕادەستی کارگێڕیی خۆجێی نەکاتەوە، شڕوشیتاڵی فڕێ دەدرێتە دەرەوە. ئێمە ئەم حەڤدە کەسە کە ناومان هاتبوو لە خانوو دەربکرێین، تەنها سێ کەسمان مابووین، ئەوانی تر هەموویان ژێر بە ژێر مشوری خۆیان خواردبوو و خۆیان لە دەرکردن ڕزگار کردبوو. لەو کاتەدا بە ئێمەیشیان وت بچن بۆ هەولێر لەوێ هەوڵێک بدەن بەڵکو ئەمە خوایە ئێوەیش ببەخشرێن.

ئەوە بوو من و نەژاد و کەمال هەرسێکمان پێکەوە چووین بۆ هەولێر بۆ لای سەرۆکی ئەنجوومەنی حوکمی زاتی لە کوردستان کە سیروان عەبدوڵڵا جاف بوو. لەپاش قەیرێک کە لای دانیشتبووین وتمان بۆ ئەو ئیشە هاتووین بۆ لات. هەڵبەتە سەردەمانێک حیزبی شیوعی لەم حوکمە زاتییەدا بەشدار بوو، هەر بۆیە سیروان جاف ئەحمەدی برامی دەناسی. یەکێکی تر لە ئەندامانی ئەنجوومەنی حوکمە زاتییەکە حەمە سدیقی پارێزەری خەڵکی سلێمانی بوو، کە سەردەمانێک پێکەوە لە ڕیزەکانی حیزبی شیوعیدا حیزبایەتیمان کردووە. حەمە سدیق لەو کاتەدا لەوێ نەبوو، بەڵام کتوپڕ پەیدابوو و هات بەبێ دەنگ دانیشت و بە تاکە یەک وشە لەگەڵمان نەدوا.

ئێمە قسەی خۆمان کرد و باسی کێشەکەی خۆمان بۆ سیروان جاف کرد. سیروان جاف بە دەم تەماشاکردنی ئەو وێنەیەی سەددام حسێنەوە کە لە ژوورەکەیدا هەڵواسرابوو کەوتە قسەکردن و وتی: ئەم پیاوە پیاوێکی باشە بۆ ئێمە. ئێمەیش وتمان: کوردیش لە خزمەتکردنی ئەو پیاوەدا درێغیی نەکردووە، ئەوەتانێ چل فەوجی دیفاعی وەتەنیمان هەیە. پاشان سیروان جاف وتی: نابێت لە کوردستاندا چێشتخانە بۆ یاخیبووان بمێنێت! واتە نابێت دێهات بمێنێت کە یاخیبووان نانی لێ دەخۆن و پشووی تێدا دەدەن. ئینجا وتی: ئەمە بڕیارە و دەبێت جێبەجێ بکرێت. ئێوە کەسوکارتان لەگەڵ یاخیبووانە و ئەو بڕیارە ئێوە دەگرێتەوە. منیش هەڵمدایێ و وتم: ئەی ڕوفائیل، برازای تاریق عەزیز، کاتێک کە فڕۆکەیەکی میگی عێراقیی ڕفاند بۆ ئیسرائیل، تاریق عەزیز بۆچی دەرناکەن لە خانووی میری؟! سیروان جاف بە سەرسوڕمانێکەوە تەماشای

حەمە سدیقی پارێزەری کرد، ئەویش بە سەرسوڕمانێکەوە تەماشای سیروان جافی کرد! دیاربوو قسەکەی من لەو قسانە بوو کە بەری دڵی دەگرت هەر بۆیە تووشی سەرسوڕمان بوون. ئەمجا هەردووکیان پێکەوە وتیان: ئەمە بڕیارە و دەبێ جێبەجێ بکرێت. ئەوجا وتیان: بچن بۆ لای پارێزگاری هەولێر. ئەوکات یەحیا جاف پارێزگاری هەولێر بوو. نەژاد و کەمال چوون بۆ لای یەحیا جاف، بەڵام من نەچووم. لە کۆتاییدا چوونەکەیان بێسوودیش بوو. ئیتر لەو ماوەیەدا کە بۆمان داندرابوو، خانووەکانمان چۆڵکرد.

## سەرۆکی شارەوانیی هەڵەبجە

لە ساڵانی پەنجادا حەمەتۆفیق سەرۆکی شارەوانیی هەڵەبجە بوو کە خەڵکی سلێمانی و گەڕەکی سەرگۆل بوو و ماڵیان لای ماڵی عیزەت بەگی جافەوە بوو. لەو ساڵانەدا قیرتاوی شەقامەکانی ناو شاری هەڵەبجە و هەروەها ناو بازاڕ و دەوروبەری مزگەوتی تەوێڵە و ڕێگاکان دەکرێت، حەمەتۆفیق بەو عەرەبییەی کە دەیزانی، دەیوت: قیرتاو مال تەوێڵە زێن، بەڵام قیرتاو مالنا میسل نانی تیری!

## ئارەقی ناو کتری

لە هەڵەبجە و لە ساڵانی پەنجادا، لە دووکانەکانی حامید بەگ لە بەر ماڵی خۆیان کە جێگای نەوت و بەنزین بوو و لای ڕۆژهەڵاتیش دووکانێک بوو پیاوێکی تێدا بوو ناڵبەند بوو، ناوی وەستا محەمەد بوو، باوکی مامۆستا تۆفیق، ئەم دووکانەی حامید بەگ پیاوێکی مسگەری تێدا بوو بە عەلە تاریکە بانگیان دەکرد.

ئەوکات هێشتا جووەکان لە هەڵەبجە مابوون. عەلە تاریکەی مسگەر ئالودەی ئارەق بوو، کترییەکی ڕەشی بچووکی هەبوو هەموو جارێک دەیگرت بە دەستییەوە و دەهات بۆ چایخانەکەی عارفی حاجی فەرەج، کە کەسایەتییەکی شیوعی ناسراو بوو، کاک عارف، کە عەلە تاریکەی دەناسی، منیش لای کاک عارف شاگرد بووم، کترییەکەی دەدا بە من و دەچووم بۆ لای شەمە، کە جوو بوو و دووکانی مەیفرۆشیی هەبوو بەرانبەر بە چایخانەکەی عومەری حەمە ملۆزم، کترییەکەم بۆ دەبرد چارەکێک ئارەقی بۆ تێ دەکرد بۆ ئەوەی کەس نەزانێت ئەم کترییە ئارەقی تێدایە، کتریم دەهێنایەوە بۆ کاک عارف، ئەویش کتری دەدایەوە بە عەلە تاریکەی مسگەر و دەچووەوە بۆ دووکانە تاریکەکەی خۆی و ئارەقەکەی دەخواردەوە. بەم چەشنە، جووەکان بە ئاشکرا مەییان دەفرۆشت و موسڵمانەکان بە دزییەوە دەیانخواردەوە.

## ڕەفیقی کرێکار

لە ساڵانی پەنجا لە گوندی بەشارەتی خواروو ئیشمان دەکرد، شەو لە گوندەکە لە ماڵی حاجی حەمەسەعید دەماینەوە کە برای وەستا سابیر عەلی وەیس بوو. حاجی حەمەسەعید کە تازە لە حەج گەڕابووەوە، شەو هەواڵیان بۆ هێنا شێخ عوسمانی شێخ عەلادینی بیارە بە میوانی دێت بۆ ئەوێ. پیاوەکەی شێخ کە هەواڵەکەی هێنا، بە حاجی وت: تورەکە و بەرگی ماینەکەی خۆت (بە بەرگەکەیان دەوت خورج، کە وەک فەرش چنرابوو) دابنێ بۆ ماینەکەی شێخ عوسمان. حاجی ماینەکەی خۆی لە ژێر ئەو دار

تووەدا دەبەستەوە کە لە بەر ماڵەکەیاندا بوو، بە نارەزاییەکەوە چوو تورەکە و خورچی لێ کردەوە و دای بە پیاوەکەی شێخ.

هاتنە ناوەختەکەی شێخ و داواکردنی تورەکە و خورچی ماینەکەی، حاجی زۆر پەست کرد، بەڵام چاریشی نەبوو. هەروەها هاتنەکەی شێخ خەوی لە ئێمەیش زڕاند کە شەکەتی کرێکاریی بوین، بەڵام وەستا مەعسومی وەستای دار و تەختە، کە خۆی بنەماڵەی شێخی باش دەناسی وتی: وەرە با تا زووە فریای خۆمان بکەوین، دۆشەک و لێفە تازەکە بۆ خۆمان دابنێین و بچینە ژێر جێگاوە و خۆمان بکەین بە نووستوو، چونکە ئەگەر بزانن هێشتا نەنووستووین ناهێڵن نە لەم ژوورە و نە بەو پێخەفانەوە بنووین. بەم جۆرە خەومان درەنگ کەوت بۆ کاتژمێر دوو، بەڵام پێخەفە باشەکەمان بۆ خۆمان دانا و چووینە ژێر جێگاوە و خۆمان لێ کرد بە نووستوو.

شێخ، لەدوای لێبوونەوە لە نانخواردن و چا خواردنەوە و پشوودان، لەگەڵ حاجی هاتن بۆ ئەو ژوورەی کە ئێمەی لێ نووستبووین. کاتێک کە بینی دوو پێخەف لە ژوورەکە هەن و دوو کەسیان لە بندا نووستوون، لە حاجی پرسی: ئەمانە کێن لێرە نووستوون؟ حاجی وتی: ئەمانە وەستا و کرێکاری خۆمانن، بە ڕۆژ خەریکن خانوومان بۆ دروست دەکەن. وە نەبێ هەر لەو ژوورەدا شوێن بۆ خەوتنی خەڵکی تر نەمابێت، بەڵکو شوێن زۆر بوو و جێ بۆ شێخیش ڕاخرابوو، بەڵام شێخ، بە بۆڵەبۆڵەوە، چووە سەر جێگاکەی ڕاکشاو و وتی: قەیچێکە با خوا ئەمشەو ئێمەی کردبێت بە ڕەفیقی کرێکار!

## حاجی تایەری قولەرەیسی

حاجی تایەری قولەرەیسی هەبوو، لە هۆزی سمایلعوزێری، گوندەکەیان لە ڕۆژئاوای سەرچنار بوو، سەرەتای ساڵانی شەست، بە دیاریکراوی لە دەوروبەری ساڵی ١٩٦١ و ساڵی ١٩٦٢ پێشمەرگە لەو ناوچەیەی گوندەکەی ئەوان دەستی بە جموجوڵ کردبوو، ئێمەیش لەو کاتەدا کۆمەڵێک نەقاڕ بووین: من، سەعە زلەی نەقاڕ دڕەیی، لەتیف نەجم ڕەباتی، عەبدوڵڵا مام ئەمین چوارباخی، سابیری مەلا کەریم چنگیانی، سەلام ماوەتیی ئاوەڵزاوای ڕەئوف زوهدی، لەو ناوچەیە لە شاخی شێرکوژ ئیشی کرێکاریمان بۆ حکومەت دەکرد، بەردمان بۆ شۆستەی جادەی عەربەت دەربەندیخان چاک دەکرد و حاجی تایەر لە بری ئەو بەردانە کە لە خاکەکەی ئەو دەرماندەهێنان، موڵکانەی لە حکومەت وەردەگرت. جارێکیان وتی: فەقێ عەلی، من ئەم گوند و ناوچەیە لە باوباپیرمەوە موڵکی خۆمە و موڵکانەی لێ وەردەگرم، کەچی پێشمەرگە گەڕی تێ ئاڵاندووم دەڵێ ئەو موڵکانەیە دەبێت ئێمە وەریبگرین نەک تۆ! منیش چووم بۆ کانیی ماران بۆ لای بارزانی تاکو سکاڵا لە پێشمەرگەکانی بکەم و کێشەکەم چارە بکەن، کەچی بارزانی هیچی بۆ نەکردم، پێی وتم بڕۆ بۆ بنکەی بەرانان.

حاجی تایەر، کە بە سواری ماینەکەیەوە و تفەنگێکی بڕنەوی لە بەر دەمیدا دادەنا و بە سەر کانە بەردەکاندا دەگەڕا و سەرانەی لەو بارهەڵگرانە دەسەند کە بەردەکانیان دەگواستەوە و بە زەوییەکانی قولەرەیسیدا دەڕۆیشتن چونکە ئەو کاتە لە خوار کارگەی چیمەنتۆوە پرد نەبوو و ئاوێکی زۆر لەو چەمەدا هەبوو کە بە چەمی چەق چەق بەناوبانگە، دەیوت: من حەوت

حکومەتم گۆڕیوە، ئەمانەیش کە ئێستا هاتوون، بۆ مریشک خواردن هاتوون، هەر دەبێت ئەستۆیان ورد بکەن و بڕۆن.

## بزنەکەی قالە

قادر ڕەشید، ناسراو بە قالەی ڕەشـەی شـەوەلی، بە بنەچە خەڵکی گوندی قڕگە، ماڵیان لە گەڕەکی خەبات بوو و کرێکار بوو لە شارەوانی، پاش ئەوەی خانەنشین کرا، بزنێکی کڕی بردی بۆ ماڵی حەمەڕەشید حاجی ئەمین لە قڕگە، بەو هیوایەی ئەم بزنە لەپاش چەند ساڵێک ببێت بە چوار پێنج بزن و خێری بۆ بداتەوە. قالە لەپاش چەند مانگێک هەواڵی بزنەکەی لە حەمەڕەشید دەپرسێت، حەمەڕەشید پێی دەڵێ: قایەر تۆ باسی چی دەکەیت، بزن چوو، گورگ خواردی! قالەیش پێی دەڵێ: باشە بۆچی ئەم گورگە لە ناو ئەو هەموو بزن و مەڕەدا گرگڕ چوو بزنەکەی منی خوارد؟! حەمەڕەشید پێی دەڵێ: قایەر، ئەو پرسیارە لە من مەکە، لە گورگەکەی بکە!

## تۆ باسی چی دەکەیت!

زۆر جـار کـە دەچــووم بـۆ بــازاڕ دەچــووم بـۆ مەیدانی ماستفرۆشان بۆ لای کوڕێکی پورزام کە لەوێ دووکانی هەبوو، قەفەزی کەڵەشێر و مریشکی دانابوو و خەریکی مریشک و کەڵەشێر فرۆشتن بوو. جا من کە لای دادەنیشتم باسی سیاسەت و حیزبی شیوعیم بۆ دەکرد، ڕۆژێک کاک ساڵحی پورزام پێی وتـم: تۆ باسی چی دەکەیت عەلی؟! وەرە با من و تۆ گرەو بکەین. وتم: لە سەر چی؟ وتی: بڕۆ حەوت شیوعی بهێنە، من کەڵەشێرێک لە ناو ئەو قەفەزەدا بەر دەدەم، ئەگەر بە هەر حەوتیان کەڵەشێرەکەیان بۆ گیرا، با ببەن بۆ خۆیان!

لەو ڕۆژگارە سەخت و تووشەدا هەرچی پێویستییەکانی ژیان بوو بە کاروانی سەربازیی لە بەغدا و کەرکووکەوە دەهات. کاتێک کە تەقە و ڕەقەیەکیش دەبوو ئەوەیشمان بۆ نەدەهات. لە ناو بازاری شار دووکانی وا هەبوو ڕەنگە پێشتر کەلوپەل و کالای سی تا چل ساڵ لەوەوبەری تێدا بووبێت. بەڵام کاتێک کە دۆخە سیاسییەکە تێکچوو هیچ دووکانێک کیلۆیەک شتی تێدا نەما. تەنانەت لە قوڕگی هیچ ئاشێکی ئارد و چەڵتووکی شاردا کیلۆیەک ئارد یاخود برنج نەما. ئەوەی لەو سەردەمەدا بە سەر خەڵکدا هات نە دەگێڕدرێتەوە و نە لە باسکردن دێت. کەچی لەولایشەوە پارتی یان مەلاییەکان دەستیان داگرتووە لە جەلالییەکان و لە سی قۆڵەوە خەریکی شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەیانن. لە قەرەداغ و بازیان و شارباژێڕ. تاکە ڕێگا کە بۆ جەلالییەکانیان هێشتبووەوە ئێران بوو.

2020